رۆمان

# تەنها رۆژێکی سارد

یوسف عیزەدین



هەولێر — ٢٠٠٨




دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- تەنها رۆژێکی سارده (رۆمان)

---

- نووسینی: یوسف عیزەدین

---

- نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین

---

- پیتچنین: کاوە حسین

---

- بەرگ: هۆگر صدیق

---

- ژمارەی سپاردن: (١٨٣٨)

---

- نرخ: (١٥٠٠) دینار

---

- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨

---

- تیراژ: ٥٠٠ دانە

---

- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٠٧)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# - دەستپێك -

لە یەکێك لە ڕۆژە هەرە ساردەکانی زستانێکی سارد و سڕدا...

شپرزە و شێواو، بەو پێپلیکانە دووروودرێژەدا چوومە خوارێ؛ کە لە کۆتاییەکەیدا سێ ڕێچکەی جیاجیا نامێزیان بۆ والا دەکردیت.

بەپێی ئاماژە و دێڕە نووسراوێکی سەر ڕێچکەی دەستەڕاست. کە بە بۆیەی سپی لەسەر پارچە شووشەسەکی مەیلەو سووری لاکێشەیی نووسراوبوو؛ دەبوو لێرەوە بچمە سەر شارێگە سەرەکییەکە و لەوێشەوە پاش ئەوەی، هەزار و پێنج سەد و پەنجا و دوو خانەی پێپلیکانەیەکی ڕەنگ سپی مەیلەو بۆرت دەبڕی. ڕێك و ڕاست ڕووبەڕووی ڕێگایەکی تەنگەبەری دووروودرێژی کاشیکراو دەبوویتەوە.

کاشییە ڕەش و سپییەکانی، لەپاڵ یەکدا.. وەك خانەکانی شەترەنج ڕێکخراوبوون.

هێشتاکە نەگەیشتبوومە نێوەڕاستی ڕێگە تەنگەبەرەکە؛ کە دووبارەبوونەوەی ڕەنگی ڕەش و سپی کاشییەکان. دەسپێك و کۆتایی ئەو خەونەی ترسناکەی وەبیرهێنامەوە.. کە نەمدەزانی لە چ شوێن و کاتێکدا بینیبووم!؟

ئەو خەونە سەیر و سەمەرەیەی کە هیچ کاتێك، نێوەڕاستەکەیم... وەبیرنەدەهاتەوە!

سەرم وەگێژەوەچوو.. لەوەدا بوو کە بکەوم؛ کاتێك زەلامێکی تا بڵێی کەڵەگەت و بەخۆ دەستی گرتم. بۆینباغێکی ڕەشی بەستبوو.. چاوی ڕاستی کوێر و ئەوەی دیکەی هەڵاوساو بوو. دەروێش ئاسا پرچ و قژی درێژ و تێکەڵ بوو. سەر و سیمای هێندەی ساردی ئەو ڕۆژە؛ سارد و سڕبوو.

خۆی لە ژێر باڵم نا و بە ئەستەم دەیتوانی هێندەی باڵای من خۆی بچەمێنێتەوە، سەری لە ژێر باڵم بهێنێتە دەر!؟...

دە پانزە مەترێك بەو چەشنە لەگەڵم هات. پاشان هەروەك ئەوەی ئەو نەبێت؛ بەبێ ئەوبینەوە لەژێر باڵمدا.. جێی خۆی كردبۆوە!!؟...

وێرد و دوعایەكی سەیری، بە چەشنێك دووبارە دەكردەوە؛ كە نەدەكرا هیچی لێ حاڵی ببم!؟.

گەرچی زیادبوونی هەنگاوەكان.. هیچی لە باڵم نەگۆڕی؛ بەڵام باڵای كابرای، وەك شێرە بەفرینەیەكی بەر هەتاو؛ هەروەك ئەوەی كە چین چین بتوێتەوە.. كورتتر و گچكەتری كردبوو.

لەو كاتەدا، بە چەشنێك بەرچاوم لێڵ و تاریك ببوو بوو.. كە نەدەكرا وەك پێشتر سەر و سیمای ببینم و بزانم هەر ئەو زەلامەی پێشووە، یان كەسێكی دی.

زیاتر هەستم بەدەستەكانی دەكرد.. كە لەنێوقەدمەوە راگیری كردبووم؛ تا ئەو دەمەش، بۆ ساتێك لێم نەترازابوو. هەمان بۆن و بەرامەی بوخورد و گوڵ و گوڵزاری دەشتەكی و شێداری دێر و پەرستگا كۆنەكان، كە لە گۆڕان لە سەرەتای هاتنییەوە.. سەری وەژان هێنابووم؛ بە هەمان شێوە و بێ گۆڕان لە كەشكۆڵەیەوە بڵاودەبۆوە.

لەوەدا بووم دەم هەڵبێنمەوە و پێی بڵێم: "تۆ كێی؟!"...

كاتێك دەنگی شكانی شوشەی گڵۆپێكی دەستەچەپی دیوارەكە... رایچڵەكاندم و بۆ تاوێك واق ورما و لەجێی خۆم راوەستام.

كە هاتمەوە سەرخۆم، لە پاڵمدا نەمابوو.. دەنگم لێ كرد.. وەڵامی نەبوو!!؟...

گوێم راگرت؛ گوێم لە دەنگی رۆیشتن و دووركەوتنەوەی نەبوو... دەمێك بوو عەردە رەش و سپییە كاشیكراوەكەم تێپەڕكردبوو!؟

نارەقمیەكی رەش و سوێر، كراسە رەشەكەمیان تەڕكردبوو. لەسەر هەردوو لاجانگم و بەشێكی گەردنم؛ بە چەشنی رووكەشی زەوییەكی خوێنڵێن.. توێژە خوێنییەكی چڵكن، قەتاغەی بەستبوو.

پاش یەك دوو ئەملا و ئەولای تر و چوونە خوارەوە بە سێ پێپلیكانەی جیاجیادا. خۆم لەبەردەم ئیستاسیۆنی سەرەكی شاری (مۆنوا)دا بینییەوە. خەڵكێكی زۆر لە

جێگە و شوێنە دیاریکراوەکاندا.. پچڕ پچڕ و کۆمەڵ کۆمەڵ ڕاوەستابوون. چاوەڕێی هاتنی میترۆکەیان دەکرد.

ئاوازێکی خەمناك، هێوری کردمەوە. بۆ ساتەوەختێك موچووڕکەیەك بە گیانمدا گوزەری کرد و خۆم دایە پاڵ ئەو دیوارەی، کە ناوی هەر چل و سێ ئیستاسیۆنی میترۆکەی لەسەر نووسرابوو.

ڕوانیمە ئەو کچۆڵە ڕەشپێستە و چاوڕەشە قژ بڕەی کە بە پێوە نۆکردیۆنەکەی دەژەنی... کراس و پانتۆڵێکی ڕەنگ قاوەیی کەمێك فش و پان و پۆڕی کورانەی لەبەردا بوو، ڕەنگی قەیتانی ئەو کالە ڕەشانەی کە لە پێیدا بوون؛ جوودا بوون، یەکێکیان قاوەیی و ئەویتریان ڕەش بوو.

سندووقێکی تەختەیی کەمێك کۆنی مام ناوەندی بەردەم کچۆڵەکە سەرنجی ڕاکێشام. کە لەسەری نووسرابوو:

{ئازیزان... کۆمەکی منداڵە هەتیوەکانی شاری (مۆنوا) لە مەسیحتان نزیك دەکاتەوە...}

ئەو ئاوازەی کە لە مابەینی پەنجەکانی کچۆڵەکە و هێنان و بردن و چەماندنەوە و نوشتانەوە و کشان و چوونەوەیەکی نۆکردیۆنەکە دروست دەبوو؛ پێدەچوو پێشتر لە جێگە و شوێنێکی دیکەی ئەم دنیایەدا بەرگوێم کەوتبێت و بیستبێتم. بەڵام ڕەنگە ئاوا بە چێژ و کاریگەر و بەسۆی نەبوبێت و پڕاوپڕ لە ئێوەوە نەیهەژاندبێتم!؟

کچە منداڵێکی گچکەی پرچ سووری چاوگەش. بە پەنجە وردە قەڵەوەکانی دەستی ڕاستی؛ ڕێنکۆزە ڕەشە ئاودامانەکەی ڕاکێشام و بە دەستی چەپی ئاماژەی بۆ میترۆکە کرد کە لەوەدا بوو بکەوێتەڕێ...

بە پەلە خۆم لە یەکێك لە دەرگاکانییەوە ئاودیو کرد. لە تەنیشت کەسێکی بەتەمەنی چاویلکە لە چاودا، جێی خۆم کردەوە؛ کە سەرقاڵی خوێندنەوەی گۆڤارێك بوو... کە پێم وابوو، تایبەت بوو بە پەروەردەکردنی جۆر و چەشنەکانی سەگ.

ماوەیەك روانیمە وێنەی ئەو سەگە جۆراوجۆرانەی؛ كە لەو وڵاتەی منی لێوە هاتبووم. نەبوون و نەمبینیبوون.

ئەو كەسەی كە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو.. چاویلكەكانی داكەند و پاش ئەوەی چاوەكانی هەڵگلۆفی.. لە نزیكەوە تێی روانیم و بزەی هاتێ، دواتر خەم دایگرت و كەوتەوە خوێندنەوەی گۆڤارەكە!!؟

بە خۆمدا شكامەوە و ملم وەرچەرخاند و رووم كردە جامە رەش بۆرەكانی میترۆكە كە لە سوچێكدا وێنەی كچە گۆرانیبێژێكی ناوداری شاری (مۆنوا)ی لەسەر بوو.

بۆ جارێك لە هۆڵە سەرەكییەكەی شاردا.. گوێم لە دەنگی بوو بوو.. بە كاوەخۆ و بە نیقاعێكی هێواش، سترانێكی بێ مانای دەچڕی.

بۆ ماوەی دوو سەعات هەمان كۆپلە شیعری دووبارەكردەوە، پاش ئەوەی كە بێزاربووم و هۆڵەكەشم جێهێشت؛ پێم وابوو كە بە درێژایی چەند سەعاتێكی دواتریش.. هەمان كۆپلەی دووبارە كردبێتەوە.

تۆ بڵێی گۆرانیبێژەكە، هەر ئەوەندەی لەیاد مابێت و بە ناچاری هەمان كۆپلەی دووبارەكردبێتەوە!؟

یان رەنگە شتێكی شاراوە و پەنهانی نێو قووڵاییەكانی دەروونم نەیهێشتبێت؛ گوێ لە كۆپلەكانی دیكەی سترانەكە بگرم و دەنگ و سەدای هەمان كۆپلەی دووبارەبۆوەی لە گوێمدات زرنگابێتەوە.

روانیمە كەسە بەتەمەنەكەی تەنیشتم، چاكەت و پانتۆڵێكی رەش و كراسێكی قاوەیی لەبەردا بوو، گوڵە مێخەكێكی سووربادی لە نێخەی چاكەتەكەی دابوو. هێشتا گۆڤارەكەی تاوتوێ دەكرد.. بە شەرم و شكۆیەكەوە سەری هەڵبڕی و پاش نەرمە كۆكەیێكی كەعابەن، زاری پەخش كردەوە و بە شێوە زمانێكی جیاواز، لە ئاخافتنی خەڵكی شاری (مۆنوا).. گوتی:

((پێ ناچێت خەڵکی ئەم شارە بێت!؟... ڕەنگە هەر خەڵکی ئەم دوورگەیەش نەبێت.. وەنییە؟! منیش خەڵکی ئێرە نیم...))

هەڵوەستەیەکی بۆ کرد و کەمێك سەری لەقاند، لە نزیکەوە تێمڕوانی و تا توانیم لێی وردبوومەوە.. دەموچاوێکی نائاسایی و سەیری هەبوو.. نە ئەوە بوو بە تەواوی لە ژن بچێت؛ نە ئەوەش بوو سەروسیمایەکی پیاوانەی وای هەبێت، کە بە ڕاشکاوی و بێ دوودڵی بڵێم پیاوە، رووکار و ئاکار هەر لە هندییە پێست سوورەکان دەچوو.

زۆر بە ئەسپایی کەوتەوە قسەکردن و گوتی:

((مێردەکەم جەنگاوەرێکی زۆر جەربەزەبوو! هێشتاکە شمشێر و خەنجەر و مەدالیا و نیشانەکانی ئازایەتی و ئارم و جلە سەربازییەکانیم هەڵگرتووە. سوارچاکی هەموو مەیدانێکی جەنگ بوو. شمشێرەکەی هێندە تیژ بوو؛ قەویترین ملی بە یەکجار دەپەڕاند! پیاوێکی زۆر پیاوانە و تۆکمە و کەڵەگەت بوو.. دەزانی چی لێهات؟!!... لە نیوەڕۆژێکی زۆر گەرمدا و لە نێوەڕاستی بیابانێکدا ون بوو...))

سەرێکی هەڵبڕی و بە چاوە مەیلەو سوورەکانی کەمێکی تێی ڕوانیم. پاشان دەستی پێکردەوە و گوتی:

((دواتر برادەرەکانی شمشێرەکەی.. خەنجەرە دەسك زیوینەکەی.. مەتارە وشك و برنگەکەی.. پۆستاڵەکانی.. جلە خوڵاوییەکانی بەریان، بۆ هێنامەوە... مێردەکەم ئێرە پیاوێکی زۆر عەجایب بوو! دەبوو جوان جوان دوژمنەکەی بناسێت و باش باش لە نزیکەوە لێی وردبێتەوە و ببینێت. جاری وا هەبوو.. لە بەیانییەوە تا ئێوارێ بەیەك تاکە دوژمنەوە خەریك دەبوو. گەر زۆر ماندووبوونایە، گۆڕەپانی جەنگیان جێدەهێشت. پاش نان خواردن و حەوانەیەکی باشی شەو، بەرەبەیان دەستیان پێ دەکردەوە... ڕینگەی شمشێرەکەی دەستی لە هەنگامە و قاوی شەڕە جەنگدا؛ دەنگێکی تایبەت و سامناکی هەبوو..))

قسە و باسەکانی هێندە سەیر و سەمەرە و عەجایب دەگێڕایەوە؛ هەروەك ئەوەی بەڕاستی لە سەردەمی شەڕە شێر و شەڕە جەنگە دێرینەکاندا بێ!!؟ مێردەکەی کردبووە پاڵەوانێکی هاوچەشن و هاوشێوەی؛ پاڵەوانەکانی نێو داستانە بێ ماناکان.

دریژەی دایە و گوتی:

((بێهوودە، ساڵانێکی دووردرێژ.. چاوەڕێی گەڕانەوەیم کرد. هەموو ڕۆژێك بۆنم بە جلەکانیەوە دەکرد و لە ئامێزم دەگرت... ساڵ بە ساڵ چرچ و لۆچەکانی دەموچاوم، زیادیان دەکرد... پێڵووەکانم زیاتر هەڵدەئاوسان.. لەوەدا بوو کە کوێر بم، دوا پزیشکێکی دەروونی، کە چوومە لای.. گوتی: "یادەوەرییەکان جێ بهێڵە و برۆ!؟ جێگە و شوێنێکی دیکەی دنیا بۆ خۆت بدۆزەرەوە" ماڵ و حاڵم فرۆشت و خۆم گەیاندە ئەم دوورگەیە و دوا مەنزڵیش لەم شارەدا گیرسامەوە، وا بۆ ساڵێکیش دەچێت، دووکانێکی تایبەتی سەگ فرۆشتنم کردۆتەوە.. شتێکی باشم کردووە.. وانییە!!؟))

لەوەدا بوو دەم هەڵبێنمەوە و وەڵامی بدەمەوە.. دەمەبۆڵێی نێوان کچ و کوڕێکی گەنج، سەرنجیان ڕاکێشام!؟...

کچەکە ڕەشتاڵەیەکی باڵابەرزی قژلوول بوو، پشتێنێکی چەرمی کەمێك گەورەی لە نێوقەدی بەستبوو.. تەنوورەیەکی پەڕپەڕەی سپی و کراسێکی شینی لەبەردا بوو.

کوڕەکەش زەردکارێکی سەر و سمێڵ سووربوو، چاکەت و پانتۆڵێکی قاوەیی لەبەردابوو... پاش ئەوەی سەرنجی هەموو کەسانی نێو واگۆنەکەمیان بە لای خۆیاندا ڕاکێشا.. هێوربوونەوە؛ هەروەك ئەوەی بەخۆیاندا شکابێتنەوە و شەرم دایگرتبێتن!؟... کوڕەکە بە تەواوی لایەکی ڕوومەتی بە جامەکەوە نووساندبوو! کچەکەش چاوی لە پێڵاوە نووك تیژەکانی خۆی بڕی بوو! بێ ئاگایانە نینۆکەکانی دەستەڕاستی خۆی دەکرۆشت و جارجارەش گەمەی بە قایش و قروشی جانتاکەی دەکرد.

کچەکە لەپڕ.. هەروەك ئەوەی شتێکی بیرکەوتبێتەوە، لەجێی خۆی ڕاوەستا و لە پشت کورسییەکەی من و کەسە بە تەمەنەکەدا ڕاوەستا.

هەنسك و لوشکە لوشکی بە ڕیتمێکی هێواش و یەك لە دوای یەك دەهاتە گوێم. هەناسەی گەرمی، کە جارەجارە بەر پشتە ملم دەکەوت.. خرۆشێکی لەیادچووەی دێرینی تێدا دەبزرواندم.

کچەکە پمیتا پمیتا، لەبەرخۆیەوە.. وشەیەکی دووبارە دەکردەوە.. بە تەواوی گوێم بۆ شل کرد، پێم وابوو چەشنێك بێت لە جوێندان بە شێوە زمانێکی کۆن و لەناوچوو.. لە دیالۆژی نێوان دوو پاڵەوانی نێو فیلمێکی مێژووییدا، هەمان وشەم بەرگوێ کەوتبوو.

کچەکە هێندە چەمابۆوە.. زنجیرەکەی ملی بەر پشتە ملم دەکەوت، تەزوویەکی سارد و سڕی بە جەستەم دەبەخشی.

پاش تاوێك زنجیرەکەی کەوتە بەشی پێشەوەی ملم و لە پڕ پسا و بەربۆوە.. بە مابەینی تووکە تێکەڵ و پێکەڵەکانی سنگمدا گوزەری کرد و تا ناوکم رۆچووە خوار، راچەنیم و بە پەلە دەرمهێنایەوە، بۆ تاوێك تێم روانی.. زنجیرێکی زیوینی درێژ بوو، خاچێکی لە عاج دروستکراوەی کەمێك باریك؛ بە ئەڵقەیەکی تەختە بەزرێزەکەوە کرابوو.

تا بڵێی شتێکی ئەنتیکا و سەیر بوو!!؟

زنجیرەکەم لە مشتم نا و ئاوڕم دایەوە.. کچەکەم نەبینی.. هێندەی چاویشم بۆ گێڕا.. بەدیم نەکرد!؟

زنجیرە پساوەکەم، لە گیرفانی پانتۆڵەکەم نا و هەڵمگرت.

هێشتا وەڵامی کەسەکەی تەنیشتم نەدابۆوە؛ ئاوڕم لێدایەوە.. رەنگی جلەکانی گۆڕا بوون.. کراسەکەی سپی دەچۆوە.. چاکەت و پانتۆڵەکەی مۆر دەهاتە بەرچاوم.. گوڵە مێخەکەکەی سنگیشی تەڵختر بووبوو.

سەیر لەوەشدا بوو، کە دەموچاوی چەند ساڵێك گەنجتر دەهاتە پێش چاوم!؟

بەشێکی تایبەتی بە زاوزێ کردن و جووت بوونی سەگ؛ لە لاپەڕە سەد و بیست و سێی گۆڤارەکەدا دەخوێندەوە. نازانم ئاگای لەوە بوو، کە تێی دەڕوانم یان نا..!؟ لاپەڕە سەد و بیست و چواری هەڵدایەوە؛ بە وێنەوە شێوە و شێوازی جووتبوونی سەگی تێدابوو.

بیست ساڵ لەمەوپێشی شەوێکی ئەو شارۆچکە دوورە دەستەم وەبیرهاتەوە، کە بە فەرمانی بەرپرسێکی ئەوێ؛ دەبوو سەرجەم سەگەکانی شارۆچکەکە.. بە شەوێك بتۆپێنرێن و لەناو ببرێن.

تا بەیانی گوێمان لە دەنگی تاق و تیقی گوللە بوو.. لە دووریشەوە جارجارە گرمەی نارنجۆکیشمان دەهاتە بەرگوێ.

بە درێژایی شەو نەمانزانی چ باسە و چ ڕوودەدات؟ لەگەڵ گزنگی بەرەبەیاندا.. وەك هەر کەسێکی نێو شارۆچکەکە بە شپرزەیی لە ماڵ هاتمەدەر و بە مەبەستی سۆراخی هەنگامەی شەوێ...

لە بە تەمەنترین پیاوی شارۆچکەکە نزیك بوومەوە...

((- لالۆ.. چ باسە!؟

- چ بڵێم کوڕەکەم.. بە ناوی کوشتنی سەگە بەڕەڵاکانی کۆڵانەکانەوە.. زۆربەی سەگەکانی ئێمەشیان کوشتووە!!

- باشە بۆ دەبێت، ئەم هەموو فیشەکەیان.. لە کوشتنی ئەم سەگە بەستەزمانانەدا بەکاربردبێت!؟

- چ بڵێم رۆڵە.. خۆ ئەم سەگانەی ئێرە هیچ کات لە خۆڕا پەلاماری کەسیان نەداوە.. تا ئێستا زیانیان بۆ کەس نەبووە.. لەمەولا پەرێشان دەبین.. بێگومان رانەکانمان گورگ دەیخوات!؟ خۆت دەزانیت، چەك هەڵگرتن لێرە قەدەغەیە؛ تا بتوانین بۆ خۆمان پاسیان بکەین.. قمیناکە با بڵێین.. ئەوە ئێمە شتێکمان پێکرا.. ئەی دەوراشینەکانی دەوروبەرمان چی بکەن.. سەگ نەبێت کێ پاسیان دەکات!؟ چەند ساڵێك لەمەوپێش؛ پێش ئەوەی تۆ بێیتە ئێرە، بە ئەمری بەرپرسی ئەودەمەی شارۆچکەکەمان.. گشت سەگەکانیان، لە شەوێکی وەك ئەم شەودا، دایە بەر گوللە و تاکو تەرای لێ قوتار بوو... ئەو دەمە کابرایەکی دەوارنشین، سێ چوار سەگی هەوشاری گورگ خنکێنەی لە ئەشکەوتێکدا شاردبۆوە... دواتر پێیان زانی و نەك هەر سەگەکان بەڵکو کابراکەشیان پێوە گوللە باران کرد.. باش بوو پاش شەش مانگ بڕیارەکەیان گۆڕی، بەڵام بەچی دەچێت وا هەمدیسان هەمان بڕیارە کۆنەکەیان خستۆتەگەڕ!؟

- باشە بۆچی!؟

- گوایە سەگەکانمان، بوونەتە سەبەبی پیسبوونی سەرچاوە ناوییەکانی ناوەوە و دەرەوەی شارۆچکەکە!؟ گوایە گەڕی و گولی بڵاودەکەنەوە.. سەدان ساڵە ئێمە لێرەدا دەژین و تا ئێستاکەش کەسمان نەبینیوە.. گەڕ و گوول بوو بێت...!؟)).

قسە سادە و ساکارەکانی کابرا.. زۆر کاری تێکردم. دیار بوو نەیدەویست ئەوەم بۆ باس بکات؛ کە سەگ لایان پیرۆزە و بەپێی بڕوای ئەوان.. ئەوەی سەگێکی لەبەر هەر هۆیەك کوشتبا، لە جێی دەکوژرا!... تەنانەت تاکە سەگێکیشیان، بە باشترین جۆری تفەنگ و خشڵ و زێڕ و زیو و پارەی دنیا نەدەگۆڕییەوە!؟...

خوێنی سەگە کوژراوەکان.. هێشتاکە نەمەیبوو...

لەهەر پەنا و پاسار و سوچێکدا؛ لە نێوەڕاست و قەراغی کۆڵان و شەقامەکاندا.. هەمان وێنەی دووبارەبووەی سەگە کوژراوەکانت دەبینی. ژمارەیەك لە گوێدرێژ و ئەسپ و پەلەوەر و تەنانەت پشیلەی لاکۆڵانەکانیش؛ هەمان چارەنووسی سەگە کوژراوەکانیان هەبوو.

لە کەلاوەیەکی لاچەپەك و دووردەستدا.. دەڵە سەگێکی بەلادا کەوتووی کوژراوم بینی؛ کە هێشتاکە خوێنی لێ دەچۆڕا و پێ دەچوو نەختێك گیانی تێدا مابێت.

سێ توتەڵە سەگی گچکە خۆیان لە سینە و سکی هەڵدەسوو... بۆنیان پێوە دەکرد.. برسی و پەشۆکا و قروسکە و نوزەیان دەهات، دەمیان لە گوانەکانی دایکیان وەردەدا و دەیانلێسایەوە.......!!؟



((تۆ کێی؟!))

پرسیارێکی کتوپڕی کەسەکەی تەنیشتم بوو...

تا دەهات گەنجتر و جوانتر دەهاتە پێش چاوم. وەك جحێڵێك عیشوە و نازی دەکرد... سیحرێکی سەیر لە چاوەکانییەوە دادەباری.

جارجارە بێ گوێدانە ئەوەی لە کوێدایە و کێ سەیری دەکات!؟ پەنجەی بۆ زۆر شوێن و ئەندامی بەدەنی درێژ دەکرد و دەیخوراند... ناتەواوییەك لە هەڵسوکەوتیدا هەبوو، زۆر جار وەك کەسێکی جددی و ناغر تێی دەڕوانیم و هێندەی نەدەبرد سیمای

بە چەند چەشنێك دەگۆڕا و دواتر خەم دایدەگرت.. زۆر جار پێکەنین و گریانی تێکەڵ دەکرد. حاڵەتە دەروونییەکانی زۆر بەخێرایی گۆڕانیان بەسەردا دەهات و لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دی تەکانیان دەدا...

دەبوو چی وەڵام بدەمەوە و چی پێ بڵێم؟!

ئەوەی کە لە کەسەکەی تەنیشتمدا بووبووە مایەی پرسیار و سڵ کردنەوەم؛ گەنج بوونەوە و هاتنەخوارەوەی ساڵ بە ساڵی تەمەنی.. گۆڕانی ڕەنگی جلەکانی.. قژ و چاوی.. زۆر گۆڕانکاری دیکەش بوو...

کە زارەترەك و پەرێشانیان دەکردم!؟

هەر چۆنێك بوو، زارم پەخش کرد و گوتم:

(( من ناوم- نامۆ جەرجیس-ە.. بە کارێکی تایبەت و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو هاتوومەتە ئێرە)).

گەرچی دەمزانی دەیەوێت درێژەی بدەمێ و بەردەوام بم، بەڵام زاری لێك نەترازان و هیچی نەگوت، بە پارچە پەڕۆیەکی گچکە هاوێنەی چاویلکەکەی پاك کردەوە.. پاش کەمێك لە چاوی نا، گۆڤارەکەی کردەوە و لە خاڵێکەوە کە بە قەڵەمێکی سوور دەستنیشانی کردبوو.. کەوتە خوێندنی گۆڤارەکە.

هێندی هێندی وەنەوز پێڵووەکانی قورس کردم. چاوم لێك نا و پاش ساتەوەختێکی کەمخایەن راچەنیم... بینینی دەسپێك و کۆتایی خەونە دێرینەکە؛ زارەترەکی کردبووم!؟...

ماوەیەك بە سەرسووڕماوی لە هێڵەکانی نێو لەپی دەستەڕاستی خۆم ڕوانی.

وەبیرهاتنەوەی ئەو خەونە، هێندە زویر و بێزاری دەکردم.. کە هەردەم ئێشێکی لە بەشێکی جەستەمدا دروست دەکرد و بە تەواویی پشێو و نارەحەتی دەکردم، دەبوو خێرا لە بیری خۆمی ببەمەوە و خۆم سەرقاڵی شتێکی دیکە بکەم!؟

تەماشای کەسەکەی تەنیشتم کرد؛ خەوتبوو.. چاوم بۆ کچۆڵە ڕەشتاڵەکە گێڕا، نەمبینی.. کەس چرپەی لێ نەدەهات و هەموو گوێیان بۆ دەنگی خێرای میترۆکە شل کردبوو.

تا دەهات لێدانی دڵم زیادی دەکرد و هێندەی نەمابوو کە دڵەکوتێ.. روحم لە کونە لوتەوە بێتەدەر، پەیتا پەیتا نارەقمیەکی شێن و مۆرم دەردەدا.

کەسەکەی تەنیشتم هەروەك ئەوەی پێشتر نەخەوتبێت و لە نزیکەوە چاودێری کردبێتم. ئەیهێشت لەوە زیاتر باری دەروونیم بشێوێت و بەرەو خراپتر بچێت.

دەستێکی خستە سەر شانم و تا هێزی تێدا بوو، رایوەشاندم... بە سەرسامییەکەوە تێی روانیم و گوتی:

((ئەوە چیتە؟! نەخۆشی...))

پاش ئەوەی یەك دوو قوومی ئاوی نێو ئەو شووشەیەم خواردەوە.. کە کەسەکەی تەنیشتم لە جانتاکەی لاتەنیشتیدا دەریهێنا. کەمێك هاتمەوە سەرخۆم.. بۆ ساتێك پزیسکی بەزەییەکی شاراوەم لە چاوەکانیدا بینییەوە.

هەروەك ئەوەی ئەو کەسەی کەمێك لەمەوپێش نەبووبێت. زۆر سەنگین و لەسەرەخۆ دەجوولایەوە.. بە دەستەسڕێکی شینی گوڵ گوڵی نارەقەی نێوچەوانی سڕییەوە، وەك کارمەندێکی پزیشکیی شارەزا، نەبزی گرتم... ماوەیەك چاوەکانی پشکنیم دواتریش هێدی هێدی کەوتە شێلانی دوو دەمارە سەرەکییەکەی مل و شانم.

هێندەی نەمابوو، بکەومە گومان لە هەموو ئەو بۆچوونانەی کە پێشتر دەرحەق بەو لە سندووقە سەرمدا، کۆمکردبۆوە...

سەعاتە بێ قاپشەکەی گیرفانم دەرهێنا و تێمڕوانی.. دوانزە و نیوی نیوەڕۆ بوو.

دەبوو لە سات و وەختی دیاریکراودا، بگەمە دوا نیستاسیۆنی میترۆکە و لەوێشەوە لەگەڵ یەکێکدا.. کە من نەمدەناسی!؟ بچمە هۆڵی دەستنیشانکراو.. بۆ خوێندنەوەی دەستنووسەکە.

گەرچی هەموو ئەم شتانەم لەنێوخۆمدا تاوتوێ دەکرد.. بەڵام هەروەك ئەوەی کەسەکەی تەنیشتم.. گوێی لە هەموو ئەم مشتومڕە نهێنییانەی نێو دەروونم بووبێت.

سەری لێ هێنامە پێش و گوتی:

((دەستنووسەکەت پێیە؟!))

بە چەشنیك لە جێی خۆم سڕبووم؛ خەنجەرێکیان لێدابام خوێنم لێ نەدەهات! تەزوویەکی سارد بە گشت نازای گیانمدا گوزەری کرد.. دواتر وەك پۆقژەیەك، لە لۆچی لای راستی لێومدا کۆبۆوە.. تا دەهات گەورەتر دەبوو، بە رادەیەك.. کە بە تەواویی شەویلگەکانی قورس و گرژ کردبوو!!... بۆ ساتێك وام هەست دەکرد، کە رەنگە ددانەکانم پێکەوە نووسابێتن و سەری زمانم هەڵناوسابێت...

برستم لێبڕا و دەست و قاچەکانم وەك تەختەیان لێهات... ملم بۆ نەدەبزوا و بە ئەستەم تەنها پێشەوەی خۆم دەبینی... پێدەچوو بەدەنم بە تەواوی ئیفلیج بوو بێت.. زۆر هەوڵمدا قۆپچەی گیرفانی چاکەتەکەم دابخەم و فایلە پێچراوەکەی ناو گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەم بشارمەوە...

بەڵام کەسەکەی تەنیشتم، بە دوو پەنجە فایلەکەی لە گیرفانم دەرهێنا و گوتی:

((مەشڵەژێ.. ئەو کەسەی کە دەبوو لە دوا ستاسیۆنی میترۆکەدا چاوەڕێت بکات... منم!!؟ دەبێت پێش ئەوەی بگەینە شوێنی مەبەست دەستنووسەکە بخوێنرێتەوە!؟ ئەو حاڵەتە دەروونییەش کە لە ئێستادا دووچاری بوویت، ئاساییە.. کەمێکی تر دەڕەوێتەوە..))

پاکەتێ حەبی مەیلەو شینی لە جانتاکەی هێنایەدەر و هەر چۆنێك بوو، حەبێکی خستە دەمەوە.. هێشتاکە بە تەواوی حەبەکە نەتوابۆوە.. کە هەستم بە خاوبوونەوەی ماسولکە و دەمارەکانم کرد و چەناگە و شەویلگەکانم کەوتنە جوولە.

یەك دوو جار لەسەریەك بە قووڵی هەناسەم هەڵمژی. ملم بە لای راست و چەپدا شکاندەوە و شتێك یاریم بە قامکەکانم کرد. دەستم بۆ پۆقژەکەی لۆچی لای راستی لێوم برد، کێم و جەراعەتی لێ دەچۆڕا.. بە دەستەسڕێك کەوتمە پاکژکردنەوەی؛ کە تا پێم بکرایە زۆر بە توندی و بە دوو پەنجە دەمگوشی.. تا بڵێی دەچرووزایەوە. بە چەشنێك ئازاری دەدام، کە پێم وابوو تەنها پۆقژەیەکی گچکە بێت!؟

هەروەك ئەوەی هەستریا گرتبێتی؛ ئەمراندی بەسەرمدا و گوتی:

((- هێدی هێدی دەستنووسەکەم بۆ بخوێنەرەوە.

- بەڵام ئەوەتا لای تۆیە، دەتوانیت بۆ خۆت بیخوێنیتەوە!

- من هیچ لە زمان و نووسین و دەستخەتی دەستنووسەکەی تێ ناگەم، دەبێت تۆ دەقاودەق و بە وەرگێڕداوی بۆم بیخوێنیتەوە!؟

- بەڵام خوێندنەوەی کاتێکی زۆری دەوێت؟!

- ئەوەی بە لای منەوە گرنگە، ئەوەیە کە بیخوێنیتەوە... با پێش وەخت ئاگات لە هەموو شتێك بێت، چونکە ئەوەی کە ئێستا بۆ منی دەخوێنیتەوە دەبێت بێ زیاد و کەم و بە هەمان شێوە لە کۆڕەکەدا بیخوێنیتەوە.

- بەڵام پێشتر لەگەڵ ئەواندا، وا ڕێك کەوتبووم... کە دەستنووسەکە لە کۆڕەکەدا بخوێنمەوە و لەوێدا ناوەڕۆکەکەی ئاشکرا بکەم.

- وا دیارە تۆ باش لە من ناگەیت.. هەر لە ناو ئەم واگۆنەدا پێنج کەسی دیکەی سەر بەو گرووپەی تێدایە کە تۆی هێنایە ئێرە.))

ئاماژەی بۆ دوانیان کرد؛ کە یەکێکیان بۆ دەرخستنی کەڵبە سپییەکانی.. بە پەنجە سێڵە پرەکەی لادا و لێوی بزواند.

ئەوەی دیکەشیان کوڕە زەردکارەکە بوو؛ کە هێشتاکە ڕوومەتی لە جامەکە جودا نەکردبۆوە.

زنجیرەکەی نێو گیرفانی پانتۆڵەکەم وەبیرهاتەوە و پرسیم:

((ئەی کچۆڵە ڕەشتاڵەکە؟!))

لە وەڵامدا گوتی:

((ئەویش سەر بە گرووپەکەی ئێمەیە..))

درێژەی دایە و گوتی:

((ئاماژەیەکم بەسە بۆ ئەوەی لێرەوە ونت بکەن و بۆ هەتا هەتایە کەس نەتدۆزێتەوە.. بەڵام ئامانەوێت زیانت پێ بگەیەنین و پێمان باشە هەموو شتێك بە ئاسایی بەڕێوە بچێت.. هێندەت لەسەرە بەو شێوەیەی کە ئێمە دەمانەوێت؛ بجوڵێیتەوە و چیمان پێ گوتیت، جێبەجێی بکەیت)).

خۆم بە بوونەوەرێکی گچکەی تێودگلاوی نێو تەونی جاڵجاڵۆکەیەکی پیر و بەڵەد دەهاتە بەرچاو؛ تەونەکەیان هێندە مەحکەمانە چنیبوو.. کە پێوە نەبوونم، نەستەم و مەحاڵ بوو!!؟

هەر دەتگوت لە نێو فیلمێکی پۆلیسیدام...

هەر لە سەرەتاوە لە ژێر چاودێری ئەواندا بووم و پێ بە پێ بە دوامدا هاتوون... هێندەی نەمابوو بدەمە قاقای پێکەنین و تێر تێر بەو تێکەوتنە سەیر و سەمەرەیەی خۆم پێبکەنم، بەڵام ئەو رۆژە هەرە ساردەی زستانم بیرکەوتەوە؛ کە دەستنووسەکەیان بۆ هێنام...

ئەو بەیانییە سێ چوار جار لەسەر یەك.. بە هێواشی... دەستێکی تۆکمە دەرگا تەختە رزیوەکەی ماڵەکانی لێدا...

هەموو رۆژێك لەو کاتەدا خۆم گۆڕیبوو.. بەڵام نازانم بۆ ئەو بەیانییە لە خۆگۆڕیندا دواکەوتبووم...

لەوەتەی وەك فەرمانبەرێکی بەرپرسی شتە مێژووییەکان، لە تاکە مۆزەخانەیەکی شارۆچکەکەدا دامەزرابووم... بەیانیان پێش هەموو کەسێك خۆم دەگەیاندە ئەوێ و زۆر بە جیدی دەوامم دەکرد.. بە تەواوی خۆم سەرقاڵی لێووردبوونەوە و پاراستنی شتە مێژووییەکان کردبوو.

دەرگاکە بۆ جارێکی تر و بە توندی لێدرا...

چەندم گوت:

((کێیە؟))

هیچ وەڵامێکم نەهاتە بەرگوێ...

دەرگاکەم ترازان.. کابرایەکی دەمامککراوی باڵابەرز خۆی کرد بە ژووردا و گوتی:

((هیچم لێ مەپرسە؟! من تۆ باش دەناسم؛ هەر بۆیە تۆم دەستنیشان کردووە.. دەزانم دوور و نزیك بە بنەچە خزمایەتیتان لەگەڵ- وەلی سلێوە-دا هەیە!... ئەم دەستنووسەی کە بۆم هێناویت، حەقیقەتی ونبوونی سندوقە پیرۆزەکەی تێدایە؛ خۆت

دەزانیت.. پاش ونبوونی قات و قڕی بڵاوبۆوە و ئاشوب و کوشت و کوشتار.. تەنگی پێ هەڵچنین... گەر دەستەڕەشەکان سندووقەکەیان نەبردایە؛ ڕۆژمان بەم ڕۆژە نەدەگەیشت!!؟... زۆر بە باشی ئەم دەستنووسە بشارەوە.. ڕاشکاوانە ناوی بکوژەکانی- وەلی سلێوە-ی تێدایە... دەستنووسەکە لای خۆت هەڵگرە تا ئەو ڕۆژەی دێمەوە..))

دەستنووسەکەی دایە دەستم و پاشان ئەموستیلەیەکی زیوینی گەورەی لە گیرفانی دەرهێنا؛ کە نقێمەکەی سەری لەجێی مۆر بەکاردەهات. نقێمی ئەموستیلەکەی لەسەر ستامپایەک دانا و پاشان بۆ تاوێک پەنجە گەورەی خستە سەر.

دواتر مۆرێکی لەسەر بەرگی دەرەوەی دەستنووسەکە دا؛ کە وێنەی بوونەوەرێکی ئەفسانەیی بوو...

پاشان بە کاوەخۆ گوتی:

((باش سەیری ئەم ئەموستیلەیە و ئەم مۆرە بکە؛ هەرکاتێک.. هەرکەسێک، ئەم ئەموستیلەیەی پیشان دایت و هەمان مۆری هاوشێوەی؛ لەپاڵ ئەو مۆرەی کە ئێستا لە بەرگی دەرەوەی دەستنووسەکەم دا.. پیشان دایت.. دەتوانیت بێ سێ و دوو دەستنووسەکەی بدەیتێ)).

پێش ئەوەی دەستنووسەکە، بخەمە نێو تاکە باوڵێکی ڕزیوی سوچێکی ژوورە شێدارە لاچەپەکە.

چەند جارێک دەستنووسەکەم لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە!! شتێک لە حەقیقەتی ونبوونی سندووقەکە حاڵی بووم. بەڵام ناوی بکوژەکانی- وەلی سلێوە-م، بە تەواویی بۆ ساغ نەبۆوە.

تەنها پیتەکانی هەوەڵی ناوی سیانی بکوژەکەی تێدا بوو؛ کە بەردەوام و لە زۆر بەش و پەرەگرافی دەستنووسەکەدا، بە چەشنێک دەگۆڕان... کە کاتێک لە خوێندنەوەی دەستنووسەکە بوومەوە.. وام هەست دەکردە، کە هەموو پیتە ئەبجەدییەکان بەپێی

گۆڕانی شوێن باس و ئاستی بەرەوپێش چوونی ڕووداوەکان.. جێگۆڕکێیان لە دروست کردنی ئاوی سیانی بکوژەکەدا کردبێت!!؟

کەسەکەی تەنیشتم، بە دەنگێکی هێدی تر و لەسەرەخۆتر کە چەشنە نیقاعێکی نهێنی و پەنهانم تێدا دەبینییەوە، گوتی:

((بخوێنەوە و تا دوا وشەی دەستنووسەکە ڕاصەوەستە!؟)) بە سارد و سڕییەکەوە گوتم:

((بەڵام... ؟!!))

کەسێك کە لە پشتمەوە ڕاوەستابوو، نەیهێشت لەو وشەیە زیاتر بڵێم.. تا پێی کرا و هێزی تێدا بوو، بۆکسێکی توندی بە پشتەملم دا کێشا... وربووم و هێندەی نەمابوو لە هۆش خۆم بچم.

کەسەکەی تەنیشتم، بە دەستێکی ئاماژەی بۆ کەسەکەی پشتمەوە کرد، هاتە تەنیشتم و لایەکی چاکەتەکەی لادا و دەمانچە شاراوەکەی بەرپشتێنی پیشان دام.. بە سیلەی چاو تێمڕانی، هەمان ئەو زەلامە کەڵەگەتە بوو؛ کە لە نێوەڕاستی ڕێگە تەنگەبەرەکەدا.. فریام کەوت و خۆی لەژێر باڵم نا.

دەستنووسە پێچراوەکەیان دایە دەستم...

چاوێکم پێداخشاند و تەماشام کرد، ئەو دەستنووسە کە من لەگەڵ خۆم هێنا بووم. ئەو دەستنووسە نەبوو، کە ساڵانێکی دووروودرێژ لە باوڵە کۆنەکەدا شاردبوومەوە.. نووسینێکی جیاواز و جودا بوو.

نەیانهێشت هیچ بڵێم.. هەردوو کەسەکەی ئەملا و ئەولام پێکەوە گوتیان:

((هەروەك ئەوەی دەستنووسە ئەسڵییەکە بخوێنیتەوە! ئاوا و بێ خۆتێکدان بیخوێنەوە))

پاش ئەوەی میترۆکە، بۆ ئاوێك لە ئیستاسیۆنێکدا ڕاوەستا و پێنج شەش کەسی نێو ئەو واگۆنەی کە منی تێدا بووم، بە پەلە پرووزێ هەروەك ئەوەی لە شتێك هەڵهاتبێتن، دەرگای واگۆنەکەیان تێپەڕکرد...

هەروەك ئەوەی پرۆڤەی خوێندنەوەی دەستنووسەكە بكەم!؟ پێشەكی شتێك لە تۆنەكانی دەنگم تاقی كردەوە و دواتر قنج و قیت بۆی دانیشتم..

پێش ئەوەی بە تەواوی دەست بكەم، بە خوێندنەوەی دەستنووسەكە.. كەمێك ئیخەی چاكەتەكەم چاك كرد و بۆینباغە خوارەكەی ملم راست كردەوە.. دوو پەڵە تۆزی سەر ئەژنۆی پانتۆڵەكەشم تەكاند... هەناسەیەكی قوڵم هەڵمژی و پاشان كەمێك قۆڵم لێ هەڵماڵی و كەوتمە خوێندنەوەی دەستنووسەكە.



# - بەشی یەکەمی دەستنووسەکە -

لە رۆژگارێکی تەڕوتووشدا، لە پشت دەرگا و لە نێو دیوارەکانی ژوورێکدا لەدایکبووم. رەنگە هەر لە ساتەوەختێکی ناواشدا، لە پشت دەرگا و لە نێو دیوارەکانی هەمان ژووردا بمرم.

ساتەکانی عومرێکی کاڵ و کرچ و بێ مانام لە روانین و تەماشاکردنی سندووقێکی کۆنینەدا بەسەربردووە؛ سندووقێکی تەختە.. سندووقێکی دێرین و رەنگ گۆڕاو.. سندووقێکی هێمن و بێدەنگ و بێ چرپە و بێ سەدا.. رەنگە لەم دنیایەدا هەر ئەو بەتەنیا ئاگای لە هەموو هەڵسوکەوت و جووڵەیەکی من بووبێت و بە تەواوی لێم حاڵی بووبێت.

سەرجەم سەرگوزشتە و ماجەراکانی ژیانم تەنها بۆ ئەو گێڕاوەتەوە، ئەو لە هەموو شتێکم تێ دەگات و گوێ بۆ دوعا و نزاکانم هەڵدەخات، پێشم وایە کە هەردەم فریام دەکەوێت و بە تەنگمەوە دێت. مەگەر ئەو ترسەیە، کە هەمیشە و بێ پشوو.. جاڵجاڵۆکە ئاسا، تەونێکی سپی لە سندووقە سەرم دا دەتەنێ؛ ئەستەمی جێ هێشتنی ئەو سندووقەم وبیاد دەخاتەوە، ناکرێت بە تەنیا جێی بهێڵم؛ بەردەوام پاسەوانێکی دڵسۆزی بووم و لە دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەکانی حاڵی بووم.

لەوەتەی هەم دەروانە سندووقە داخراوەکە.. ئەشم هێشتووە ئەکەس بترازێنێت؛ ئە بۆخۆشم هەوڵی کردنەوەیم داوە.. بێجگە لە پاککردنەوەی چواردەوری و سڕینی رۆژانەم؛ زاتی ئەوەم نەکردووە کە بە لایدا بچم!؟ لە رۆژە پیرۆزەکانیشدا چواردەور و سەری سندووقەکەم، بە ڕێحانە و گوڵ و گوڵزار دەڕازاندەوە و چەند جارێکیش گوڵاو پرژێنم دەکرد.

هێندە جێگەکەی بەرزبوو، پەیژەیەکی تایبەتم بۆ دروست کردبوو، بەردەوام ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکرد.. بۆ دەبێت بەو بەرزییەوە و لەسەر ئەو تاقە دانرابێت، بۆ دەبێت چواردەوردەکەی بزماررێژ و بە ئەڵقە و قفڵ و زنجیر دەورە درابێت.

سێ قفڵ؛ یەکێکیان گەورە و دوانیان بچووك.. سەری سندووقەکەیان قایم کردبوو. دوو قفڵی دیکەی ژەنگاویش، ئەم سەر و ئەو سەری زنجیرە تێکئاڵاوەکەی پێکەوە قایم کردبوو، تاقەکە بە دوو ستوونی ئاسن پاڵپشت کرابوو. زۆر بە وردی و ئەندازیارانە حیساب بۆ هەموو شتێك کرابوو؛ بە چەشنێك، کە مەگەر بوومەلەرزەیەکی توند بیتوانیایە لەجێی خۆی بیجوڵێنێت و بەریداتەوە. دەبێت تاقەکەی ژێری.. دیوارەکەی پشتی.. کێ دروستی کردبێت؟!!

سەبارەت بە دروستکردنی سندووقەکە، وەکو باوکم بۆی گێڕابووەوە.. گوایە ئیبراهام ناوێك لە حەوت مانگدا دروستی کردووە! تەختەکەی لە دوورگەیەکی دوورەدەست وەچنگ کەوتووە؛ حەوت جار ڕەنگی گۆڕیوە، تا ئەم ڕەنگە ناناشنا و نائاساییەی لەخۆگرتووە...

زۆر جار باوکم هەر بۆخۆی ئەم بەسەرهاتەی بە جۆرێکی تر دەگێڕایەوە و دەیگوت:

((نا نا کوڕم.. کام ئیبراهام" ئەو حاخامێکی زەمانی خۆی بوو!!؟ دارتاشی چی؟! کوڕەکەم سندووقەکە بە دروستکراوی لە هندستانەوە هاتووە. نازانم کێ دروستی کردووە؟! وەکو دەگێڕنەوە ئەم سندوقە لە دارێکی پیرۆز دروست کراوە.. کەلە نزیك پەرستگاکانی (شاوولین)ی بودیستەکانی چیاکانی (هیمالایا)ی (تیبت)دا دەڕوێ. گوایە ئەم جۆرە سندووقانە، بە دەستی گەورە ڕەبەنی بودیستەکان دروست دەکرێت و بە ڕەنگەکەیدا دەناسرێتەوە. لە هەمووشی گرنگتر.. وەکو دەڵێن، گەر ماوەیەکی دووروودرێژ بە تەنیا لەگەڵیدا بێنیتەوە. ڕوحەکانی نێو سندووقەکە، کارەسات و ڕووداوەکانی ڕابردوو یان داهاتووی؛ یان کەسانێکی ترت.. بە وێنە لەسەر سندووقەکە پیشان دەدەن!!؟...)).

لەوەتەی هەم، بەرامبەر بە حەقیقەتی دروستکردنی ئەم سندوروقە و چۆنێتی هێنانی، بۆ نێو ئەم خانوودی کە ئێستا و ساڵانێکی درێژە بە تەنیا تێیدا دەژیم؛ سەدان پرسیارم لەخۆم کردووە. رامان و تێڕوانینی هەردەم و بەردەوام و بێ پسانەوەم؛ راپێچی ئەملا و ئەولایان کردووم. وەك ئەخۆشێك چۆن بە شوێن دەرماندا دەگەرێت، ئاوا بە شوێن وەڵامێکدا وێڵ و عەودالّ بووم.. ساڵانێکی دوورودرێژی عومرم، بە رەبەنی و لەم پێناوەدا بە هەدەر چوو.

ئەو خەڵکانەی کە دیارە زۆر بە کەمی رێم دەدان و دەهاتنە زیارەت و سەردانی — سندوروقەکە- هەمیشە ئەوەی ئەوان دەیانبینی و ئەوەی من دەمبینی جیاواز و جودا بوو. پیرترین دینداری ناوچەکە، هەر لە یەکەم جارەوە چی بینیبوو.. هەموو جارێك هەمان نەخش و نیگاری باڵندە و ئاسکەکێوی زامداری دەبینی. تەنها لە رۆژە پیرۆزکاندا نەبێت، وەك بۆی دەگێڕامەوە.. هێڵکارییەکان تێکەڵ دەبێت!؟ بە چەشنی نەخش و نیگارەکانی فینجانە قاوەیێك؛ دەبێت رەمز و ئاماژەکان بدۆزیتەوە.. لە راتای جفرەکان تێ بگەیت.. دواتریش شتێك بڵێیت.. شتێك کە نازانیت، بۆ دەیڵێیت و چۆن چۆنی دەری دەبڕیت!؟

لەو کاتانەدا پرسیارم لە دینداری ناوچەکە دەکرد و دەمگوت:

((تۆ چی دەبینی؟!))...

ئەویش هەردەم هەمان شتی دووبارە دەکردەوە:

((نەخشەی کۆنە وڵاتێك دەبینم!.. سەیرەکە لە نێوەڕاستیدا قەڵایەکی رووخاو هەیە. کوژراو و بریندارێکی زۆر لەو ناوەدا کەوتووە، گوێم لە فیغان و نرکە و ناڵەی زامدارەکانە.. شەرە جەنگێکی بێ ئامانە!!.. پێمولیە دنیا خوێن دەبیات...))

بەو پێیەی کە دینداری ناوچەکە؛ بەردەوام هەمان شتی دەبینییەوە.. خەڵکی ناوچەکەش لە ژێر کاریگەری ئەودا، هەمان شتیان دەبینی.

لە نێوەڕاستی لای سندوروقەکەدا، بە خەتێکی تێکەڵی زمانێکی دێرین و لەناوچوو، شتێك نووسرابوو؛ پاش ئەوەی گەورە بووم و لاپەڕەی چەندەها کتێب و فەرهەنگ و

سەرچاوەی مێژوویم هەڵدایەوە.. شتێکم لە سەروسیمای پیتەکان ناسییەوە، بەڵام هەرکاتێك بە جیددی لێی نزیك دەبوومەوە.. لیلایەك بەرچاوی دەگرتم، پیتەکان مێروولە ئاسا و بزۆزانە ڕێنچکەیان دەگۆڕی، لە خاڵێکی سندووقەکەوە ئاودیو دەبوون و دیار نەدەمان؛ یان جێگۆڕکێیان دەکرد و ئاوێزان و تێکەڵ دەبوون.

کۆنە سندووقێك و تەلیسمێکی سەیر؛ نهێنییەکی شاراوە و پەنهان!!؟ هەردەم وامدەزانی کەسێك لە نێویدا دەژی و لە نزیکەوە دەمناسێت و چاودێریم دەکات.. شەوانە گوێم لە نرکە و ناڵە و گریانی بوو، گریانی پیاوێکی کەنەفت و پەککەوتە" گریانی کەسێکی بێ دەسەڵات و هەشبەسەر.

لە ڕۆژگارە تەڕ و تووشەکانی زستاندا و پاش بەردەوامبوونی شەستە بارانێکی بەخوڕ.. دارەڕاو چیلکە و چەوێڵ و مشەما و چینکۆ و پووشەکای تێکەڵ بە قوڕە سوورەی سەربانەکە؛ بەرگەی نەدەگرت و هەردەم دڵۆپە ئاوەکانی باران لە درز و کەلێن و کون و کونۆچکەکانە.. دەهاتنە ژوور و پانتاییەکی زۆری مابەینی ژێردارەڕای بنمیچەکە و مشەما پێداکوتراوەکان داگیر دەکرد؛ دواتر دڵۆپە ئاسا لە کۆمەڵێ کون و کونۆچکەی جیاجیادا دادەبارینە خوار.

دڵۆپە ئاوەکان، بەڕە شڕە ڕەنگاوڕەنگەکەی پێش سندووقەکەیان؛ تەڕ دەکرد و هێندەی تر وێنەی تاووسەکەی سەریان کاڵ دەکردەوە... هێدی هێدی بەن و دەزووی بەڕەکەیان ڕیشاڵ ڕیشاڵ دەکرد.

فرمێسکی ئەو زاتە و دڵۆپەی ساپیتەکە، وەك دوو ڕەنگی جیا و جودا.. لە ڕاست و چەپی بازنەیەکدا هەڵدەسوڕان و هەرگیز تێکەڵ نەدەبوون!؟ ئەو دوو ڕەنگەی کە تەنها لە تاریکیدا دەبیندرا و هەر لەگەڵ داگیرساندنی یەکەم تەڵی شقارتەدا ون دەبوون و وەك خەیاڵێك دەڕەوینەوە و تووشی گومان و سەوداسەری و غایەڵەیێکی قووڵیان دەکردم.. غایەڵەی بەردەوامبوونی شتێك، غایەڵەی هەبوونی شتێك.. شتێکی زنجیرکراو و زیندانی، شتێك کە نەدەکرا، یەك لە دوای یەکی قفڵەکانی بۆ بشکێنم و سەری سندووقەکەی بۆ بترازێنم و ئازادی بکەم!!؟

هەمیشە لەم تێڕوانینەم پەشیمان دەبوومەوە و پاشان لەبەرخۆمەوە دەمگوت:

((پێم وانییە، ئەو زیندانی بێت!؟ ئەم هەموو قفڵ و زنجیر و مێخ و بزمارانە؛ تەنها لەمپەرێکی نێوان ئێمە و ئەوێکی پیرۆزە...))

سندووقەکە تەلیسماوی لەسەر تاقێکی بەرز و لەسەر دوو ستوونی ئاسن و لە ژێر بنمیچەکەدا راوەستابوو؛ هەروەك ئەوەی دێوێك لە عەردی بەرزکردبێتەوە و لەوێی دانابێت!!؟

پێ نەدەچوو، چەند کەسێکیش لە توانایاندا بێت و بتوانن ئەو سندووقە لە جێگەکەی خۆی بجوڵێنن و بیهێننە خوارێ.. دەبێت چۆن چۆنی بەرزکرابێتەوە و خرابێتە ئەو جێگەیە، کە بۆخۆی پرسیارێك بوو.

بۆ دەبێت لێرەدا لە دایك بووبێتم!!؟ وەکو دایکیشم دەیگێڕایەوە؛ زۆر بە زەحمەت لە دایك بووم. لەوەشدا بووە کە لە نێو سکی دایکمدا بخنکێم و بمرم!؟

بەڵام هاواری مامەنەکە: ((مەدەد ئەی روحی پیرۆز))....

فریام کەوتووە و پاش تاوێکیش لەدایکم بەربوومەتەوە!!؟

هەردەم سندووقەکە بەشێکی جیانەکراوەی ژیانم بووە...

عەوداڵ بوون و گەڕان، هەمیشە سەدان پرسیاری لە سەندووقە سەرمدا کۆکردۆتەوە و بەناچاری کەوتوومەتە خوێندنەوەی کتێبە مێژوویی و دەقە پیرۆزەکان. هەر لە سەرەتاوە بە دووی لوغز و پەنهانی سندووقەکەدا چووم و بێهوودە چەندەها وەڵامم داتاشیوە.

لەسەرە مەرگی هەموو ئەو کەسانەی، کە دەرحەق بە سندووقەکە شتێکیان دەزانی .. ئامادە دەبووم و بۆ دواجار داوا و تکای درکاندنی حەقیقەتی سندووقەکەم لێدەکردن... دیارە دەرئەنجامیش بێدەنگی بوو؛ بێدەنگییەك کە ئیدی بۆ هەتا هەتایە نە هیچیان پێ دەگوترا و نە هیچیشیان دەبیست.

جاری وا هەبوو تووڕە و کەللەیی دەبووم و هەروەك ئەوەی بمەوێت بە قوولەی قافدا هەڵگەڕێم، بە پەیژەکەدا هەڵدەگەڕام و هێندەی نەدەما بەنیازێکی جودا و جیاواز لە

پاككردنەوە و رازاندنەوەی بە گوڵ و گوڵزار، دەستی لێبدەم؛ بەڵام هەردەم دەنگێك لە ناوەڕا پێی دەگوتم:

((دەستی لێ مەدە!!....))

دەرگای ژوورەكەم ئەو دەمانە واڵا و كراوە بوو؛ كە كەسانێك بۆ هەڵڕشتنی رازی دڵیان و كردنەوەی گرێ كوێرە دەروونییە نهێنییەكانیان و رەوینەوەی خەمە پەنگ خواردووەكانیان.. روویان تێدەكردم و لە حزووری سندووقەكەدا سام دایدەگرتن.

لە هەموو جێگە و شوێنێكەوە دەهاتنە لام، هەموو شتێك بە ریتمێكی ئاسایی و سروشتی بەڕێوەدەچوو؛ تا ئەو كاتەی –وەلی سلێوە– ناوێكم لێ پەیدابوو. بەشێوازێكی جودا و سەیر كەشێكی تایبەتی خوڵقاند و پاشان بۆ ماوەیەكی زۆر لەبەردەم سندووقەكەدا بە چۆكدا هات و دواتر رووی تێكردم و گوتی:

((دەكرێت پێكەوە زۆر شت بخوڵقێنین.. هێندە بەسە كە خەڵكانێك قەناعەتیان پێتە!؟)).

لە وەڵامدا گوتم:

((هیچ تێناگەم!))

پاش ئەوەی دەستی بەریش و سمێڵە تێكەڵ و پێكەڵەكەمیدا هێنا و كڵاوە رەشە گچكەكەی سەری راست كردەوە.. پاش تاوێك تێڕوانین و لێووردبوونەوە گوتی:

((دەبێت پێكەوە شتێك بخوڵقێنین.. شتێكی بێ كۆتا.. شتێك كە كەس نەزانێت، كەی و چۆن دەست پێ دەكات. شتێكی نهێنی و پەنهان!!... رەنگە سەرنجی ئەو دوو هێلكارییە تێكەڵەت دابێت؛ مەبەستم لەو دوو هێلكارییە تێكەڵەی لای دەستە چەپی سندووقەكەیە!؟)).

لە وەڵامدا گوتم:

((نازانم.. سەرنجم نەداوە!؟)).

درێژەی بە قسەكانی دا و گوتی:

((باشترە تێی بڕوانیت و لێی وردبیتەوە.. دەبێت، بۆ جارێکی دی سەرجەم کتێبە پیرۆزەکان بخوێنیتەوە)).

ئیدی قڕ و قەپی لێ کرد و تا ژوورەکەشی جێهێشت؛ هیچی نەگوت... لە هەگبەکەیدا کتێبێکی قەبارە گەورەی دەرهێنا و بۆی جێهێشتم.

کەوتە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبەکە، زیاتر بە کتێبێکی مێژوویی دەچوو.



بەسەر بەرزە گردێکەوە، بە تەنیا خانۆچکەکەم قووت بووبۆوە، کە دیارە بە تەواوی کەس نەیدەزانی کەی و لەلایەن کێوە دروست کراوە، گەرچی گەر لە دەرەوەوە تێتڕوانیبا، تەنها ژوورێك و هەیوانێك و حەوشەیەکت دەهاتە بەرچاو، بەڵام لەژێر ژوورەکەدا ژێرزەمینێکی فراوان و پڕ داڵان و بێ کۆتا هەبوو؛ گەر چوویایتە نێوی، پاش تاوێك تەنگەنەفەس دەبوویت.. چەشنە خوروویەك هەموو ئەندام و بەشەکانی جەستەتی دەتەنی؛ پێ بە پێ و بەدەر لە ویستی خۆت، لە لێواری هەتریا و کەنارەکانی شێتی نزیك دەکردیتەوە.

بە تەنیا ژێرزەمینەکە بۆ خۆی؛ بە چەشنی پریاسکەی پێچراوی کۆچەرییەك، دەیان شتی لەخۆ دەگرت.. چەندان حیکایەت و سەرگوزشتەی دێرینی، لە هەناویدا جێکردبۆوە؛ هەندێکیان دەم بە دەم دەگێڕدرانەوە و پشتاوپشت دەگوتران.

گڵی عەردی ژێرزەمینەکە، بۆربوو، هەر کاتێك ویستبێتم پاچکاری تێدا بکەم و نەختێك رووکارەکەی لادەم و شتێك رۆبچمەخوار؛ سەرەتا دەسکی پاچەکە دەشکا.. دواتر بەرچاوم لێڵ دەبوو.. جگە لە تەنگەنەفەسی و هەناسە سواری کە رێگەیان لێدەگرتم، تەنگە تاویان دەکردم و ناچار هەڵدەهاتم!...

بێگومان شتێك یان چەند شتێك لەژێر عەردی ژێرزەمینەکەدا حەشار درابوو، خەڵکی ناوچەکە پێیان وابوو.. کە گوایە، چەند کوپەڵە زێڕێك و خاوەنەکەی.. دەمێك ساڵ لەمەو پێش لەوێدا نێژراوە؟!

دەبوو ڕاڕەو و داڵانە تاریکەکانی ژێرزەمینەکە بگەنە کوێ و بە چ مەبەستێك دروست کرابێت!؟

گژوگیا و درەختی میوە و دار و دەوەنی هەمەچەشن، بە چواردەوری پەرژینی خانۆچکەکەمدا، باڵای کردبوو. کانییەکیش هەر لە نزیك دەستەڕاستی قاپییەکەی دەرەوەدا؛ لەسەرخۆ و بە هێمنی لەژێر تاوێرە بەردێکەوە هەڵدەقوڵا و هێدی هێدی ڕێچکەی دەبەست.. دواتر بە بن دار و درەخت و دەوەن و ڕووەکە هەمە چەشنەکانی گردەکەدا، بڵاودەبۆوە...

بەهاران لە مێروو و مرۆچە و پەپوولە و مێش و مەگەز و دەعباکان ڕادەمام!؟ ئەوەی سەیریش بوو بەلامەوە.. دووپشك و ماری بێ ئامانی سەرگردەکە نەیاندەگەستم و لەبەر پێیەکانمدا سڕدەبوون. خەڵکی ناوچەکەش وەك موعجیزەیەك دەیانڕوانییە ئەو حاڵەتە و بە کەرامەت و یەکێك لە نیشانەکانی پیرۆزییان دەزانی.

زۆر لەو دایك و داپیرانەی کە ڕوویان تێدەکردم؛ کچ و کچەزای خۆیانیان پێشکەش دەکردم و خۆشحاڵ دەبوون بەوەی کە زاواکەیان پاسەوانی شتێکی پیرۆز بێت!؟

بەم جۆرە باسانە پەست دەبووم، زاردەترەك و پەرێشان دەبووم.. ماوەیەك لەجێی خۆم کرِدەبووم و بێ هەست و خوست لە لەپی دەستە ڕاستی خۆم دەڕوانی، دواتر لەرزێك بە بەدەنمدا گوزەری دەکرد و شوێنێکم گۆت و ئیفلیج دەبوو.. پەنجە کەڵەم هەڵدەناوسا.. لەو کاتانەدا کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دەدا و هاوارم دەکرد؛ یان پێم وابوو کە هاوار دەکەم!!؟

هەردەم لەکاتی وورووژانی بابەتێکی وادا.. سام و سلکردنەوەیەکی تایبەت ئێخەیان پێ دەگرتم، هەروەك ئەوەی مرۆچە بە لەشمدا هەڵگەڕابێت؛ دووچاری مامەخولێ و بە چەنگ گەڕانیان دەکردم.. گەڕان بە شوێن مرۆچە سوورەکانمدا.. ئەو مرۆچانەی کە هێندەی دەنگی تکەتکی دڵۆپە ئاو.. بێزارکەر و هێندەی ئێشی شوێن پێوەدانی زەردەزیڕەیەکیش گەستنیان سوێی دەخستە گیانی بنیادەمەوە... ئیدی

گزەمی بیرکردنەوەم دەشڵەقاو وەك ئەوەی شتێکم ون کردبێت؛ بە چوار دەوری خۆمدا هەڵدەخوولام.. دڵەرزینگی و دڵەڕاوکێ هاتەران و پاتەرانیان پێ دەکردم و هەردەم لەو کاتانەدا شتێکم دووبارە دەکردەوە....!!؟

ئە بۆخۆم لە یادم دەما.. ئە کەسەکانی دەوروبەریشم دەیانزانی کە چی دەڵێم!؟

سەلکردنەوەم لەو ساتە وەختانەوە دەستی پێکرد.. کە هەرزەکاربووم و لەنێو دەوەن و گژوگیای چرو پڕی سەرگردەکەدا.. رۆژانە کچۆڵەیەکی رەشتاڵە و قژ لوول بە تووشەوە دەبوو؛ کە هەردەم رەشەگەماڵێکی لەگەڵدا بوو؛ وەك پاسەوانێکی تایبەتی کچۆڵەکە.. بە دەوریدا دەگەڕا و کلکە سووتێی بۆ دەکرد.

هەرکەسێك گەر لە دووری چەند مەترێکیشەوە، لە کچۆڵەکە نزیك ببوایەتەوە. بێ سێ و دوو گەماڵەکە دەکەوتە ددانە جیڕە و کەڵپە پیشان دان و حەپەحەپ و مڕەمڕ، گەر بەختیرایی ئەو کەسە لەو ناوە دوور نەکەوتایەتەوە.. ئەوە بە دڵنیاییەوە سەگەکە شاڵاوی بۆ دەهێنا و پەلاماری دەدا.

ئیدی نازانم چۆن بوو؟! هەر بە ناماژەکردن و دوور بە دوور سەرەتاکانی حەز و ئارەزوویەکی شێتانە لەنێوانماندا دروست بوو.. پاش رۆیشتنی نامەی بۆ جێ دەهێشتم و شتی سەیر و سەمەرەی بۆ دەنووسیم... یەکێك لەو نامانەی، کە بۆی جێهێشتبووم؛ سەرباری هەوڵ و تەقەڵلای بەردەوامم بۆ لەبیربردنەوە و سڕینەوەی... بەڵام زۆر جار لە کەلێنەکانی خەوتنەوە دەچۆڕایە نێو پەڵە هەورە پەمەییەکانی ساتەوەختێکی خەونەکانم.

بە قەڵەمێکی سوور نووسیبووی:

{نازانم بۆ وا هەست دەکەم.. کە دەمێك ساڵ لەمەوپێش؛ چواردەوری ئەم بەرزەگردە دەریاچە بووبێت و ئێرەش دورگەیەکی ئەفسووناوی...

وا هەست دەکەم، بە تەنیا و لەو زەمانەدا لێرەدا ژیابێتم و ئەو گەماڵە سەگەشم بەدەستی خۆم لەنێو ناوی دەریاچەکەدا خنکاندبێت..!؟

یان زۆرجار پێم وایە، کە رەنگە پێشتر ژەهرم دابێتێ و پاشان کەلاکەکەیم پارچە پارچە کردبێت و بە ئاراستەی جیاجیادا؛ تا دەستم گەیشتبێت فڕێم دابێت. تۆشم بەو

کەشتییەوانە تەنیایە دێتە بەرچاو.. کە لە شەوێکی ئەنگوستە چاودا، گەردەلوول و گەردا و کەشتییەکەتیان بە ئاراستەی دورگەکەدا هێنابێت و لەوێدا یەکترمان ناسیبێت؟! رەنگە یەکەم رامووسانیشتمان لەژێر سێبەری پیرە چنارەکەدا بووبێت..}

ئیدی پاش ئەم نامەیە.. هەرچۆنێك بوو، لە ئێوارەیەکدا سەگەکەی لە جێگەیەکدا غافڵ کردبوو.. گەیشتە لام و بەوپەڕی حەز و تامەزرۆییەوە، زاری لە زارم نا و بۆ چەند ساتێك نغرۆی ئەو ماچە شەهوەتئامێز و بەموچڕکە و بەسۆیە بووین؛ کە یەکەم ماچ و دوا ماچێکی ژیانم بوو.. ماچێکی مزر و تەڕ و ئاودار... ماچێك کە بەدەستەملانێی زیاتر و ئاوێزان و تەپاوتلی سەر سەوزە گیاکە تەواو و نەبوو؛ ماچێك کە لە گەرمەیدا.. گەماڵەکە کەڵبەکانی گەیاندە نێو گەڵم و کۆڵەواری کردم!؟

هەردەم پەشیمانی، دەروونی کرمە ڕێز دەکرد.. دەگەیاندمە ئەو یەقینەی کە ناکرێت؛ لە پانتاییەکانی دەسەڵاتداریێتی شتێکی پیرۆزدا، چارۆکەی کەشتی حەز و ئارەزووەکانت بخەیتە بەر رەشەبای شەیتانەکان.

هەموو ژیانم لە هەوڵی سڕینەوەی ئەو گوناهەدا بردە سەر و هەمیشە دوودڵ و بەگومان بووم!؟ لەو دەمانەشدا کە دەمویست دڵی خۆم خۆش بکەم و دەرگا لەڕووی جرجە رەشەکانی خەیاڵی ئەو ساتە وەختە کڵۆم بدەم؛ ئەو دەمانەی کە دەبوو دەمارە تێکەڵ و پێکەڵەکانی ئازار چەشتنم سڕ بکەم... دەستم لە گیرفانم دەنا و ئەو دەفتەرە گچکەیەم دەردەهێنا؛ کە چەند دێڕێك لە سووچێکی بەرگەکەیدا نووسرابوو.. وەك وێردێك دووبارەم دەکردەوە و دەمگوت:

((من تەنها پارێزەر و پاسەوانێکی دڵسۆزی ئەوم
ئەوێکی شنە با ئاسا هێمن و لەسەرەخۆ...
ئەوێکی دڵخۆشکەرە و بە ئارام
من شتێکم وەك هەموو شتە نزیکەکانی ئەو...))



کتێبەکەی ـوەلی سـڵێوەـم لەسەر دژشەکە خامەکە بەرزکردەوە و کەوتە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی.. لە سەرەتاوە بۆ ناوەڕاست و لە ناوەڕاستیشەوە بۆ سەرەتا...

بەم چەشنە بەردەوام بووم و هێندەی نەبرد تەلیسمێکی سەیرم لەنێو لاپەڕەکانیدا بەدی کرد. هەروەك ئەوەی پزیسکی لێ بپێتەوە... لەجێی وشە.. وێنەی جۆراوجۆرم دەهاتە بەرچاو.. بەرجەستەتر و ئاشکراتر و ماجەرای شەڕەجەنگ و بەسەرهاتی مێژوویەکی دێرینم لێ وەدەرکەوت. گوێم لە رنگەی شمشێر و حیلەی ئەسپ و گریانی منداڵ و زریکەی ئافرەت و ناڵە و هاواری کەسانێك بوو.. خوێن سەرپەنجەکانی تەڕکردبوو!؟

تەپوتۆزی شوێن چوار ناڵەی ئەسپەکان و گلانی سوار چاکەکان، بەرچاوی تەڵخ و لێڵ کردم؛ ئیدی نەدەکرا هەموو کەلێن و قوژبنێکی شەڕەکە ببینم. ئەوەی کە دەکەوتە بەرچاوم بەشێکی شەڕە جەنگەکە بوو، بەشەکانی دیکەی دووکەڵ و تەپوتۆز راپێچی دەکرد و وێنەکانی دەشێواند.

دەبوو لە جێگەیەکەوە بچمە جێگەیەکی تر؛ وەك راوچییەك خۆم بۆ نێچیری وێنە و دیمەنەکان بنێمەوە.. دەبوو لە ـوەلی سـڵێوەـ و کتێبەکەی تێبگەم. بەڵام لەنێو ئەم هەنگامە و بگرەو بەرەیەدا، ئەستەمە بزانم کە دەیەوێت چیم پێ بڵێت!؟

هێندەی بەلای منەوە گرنگ بوو.. بەسەرهاتی کۆنە مێژووی سندووقەکە بوو؛ ئەویش بۆخۆی مەحاڵێك بوو، تا سەرە هەودای گلۆڵەیەکت دەدۆزییەوە.. سەرە هەودای سەدان گلۆڵەی ترت لێ دەئاڵۆزکا.

هێندەی نەمابوو کە کتێبەکە لە قوڕنەیەکی ژوورەکەدا جێ بهێڵم؛ کە وێنەی دوو جەنگاوەری رووتم بینی.. هێندەی قەبارە و بارستایی چوار زەلام؛ ماسولکە و دەماری پێچاوپێچ و چرچ و لۆچی جەستەیان دەربۆقی بوو.. هەر بە تەواوی دوو دێوە زەلام بوون، بۆ خۆیان.. باڵابەرزترین جەنگاوەری نێو کتێبەکە نەدەگەیشتە نێو قەدیان.

بەگوڕ و تینێکی سەیر و هێزێکی لەبن نەهاتوو، دریان بە قەڕەباڵغییەکە دەدا، راست و چەپ گورزیان دەوەشاند؛ مەتاڵەکانیشیان کردبووە سپەری تیر باران و سەرەڕمەکان.

دوو جەنگاوەری بێ وێنە و ئەفسانەیی بوون! دەم و لێو و ناوچەوانیان کوترابوو!؟ هێندە لێم هاتنە پێش، کە پێم وابوو لە دوو توێی کتێبەکە دێنە دەر و پەلامارم دەدەن... بەڵام لەپڕ ناراستەیان گۆڕی و بەرەو کەلاکی حوشترێکی رەنگ خۆڵەمێشی زۆر گەورە، هەنگاویان نا.. هەردوو دێوە زەلام.. لەنێو کۆڵەباری حوشترەکەدا، سندووقێکیان دەرهێنا، کە لێکچوو و هاوشێوە بوو لەگەڵ ئەوەی نێو ژوورەکەم.

بێ سێ و دوو و بەپەلە هەروەك ئەوەی شتێکی زۆر سوکەڵەیان لە عەرد بەرز کردبێتەوە.. بەخێرایی دوورکەوتنەوە و لە پانتاییەکانی تۆز و خۆڵەکەدا ون بوون.

ئیدی خۆڵباران هەموو وێنەکانی نێو کتێبەکەی داپۆشی و بەناچاری لاپەڕەکانیم لێك نا و هەستامە سەرپێ و لە سندووقەکە نزیك بوومەوە.

لەبەر خۆمەوە کەوتمە قسەکردن:

((تۆ بڵێی مەبەستی -وەلی سلێوە- ئەوە بێت؛ کە ئەم سندووقە و ئەو سندووقەی نێو کتێبەکە هەمان شت بن و لەو مێژوو و زەمانە کۆنەوە گەیشتبێتنە ئێرە!؟ تۆ بڵێی هەر ئەو دوو جەنگاوەرە، دۆڵ و دوند و ئشێو و شیو و هەڵدێری جۆراوجۆریان بڕیبێت و شەو و رۆژ بێ وەستان و حەسانەوە.. رۆژ و هەفتە و مانگیان لێك گرێ دابێت!؟ دواجار ئەم ژێرزەمینە نهێنییەیان بۆ دروست کردبێت. پێ دەچێت کلیلی قفڵەکانیشیان قووت دابێت!!؟ یان رەنگە لە قوژبنێکی ژێرزەمینەکەدا حەشاریان دابێت...)).

ئەو کتێبەی کە بۆی جێهێشتبووم.. شتێك بوو وەك سندووقەکە. هەردووکیان وێنەی زیندووی رووداوەکانیان پیشان دەدایت.

بە سایەی سەری سندووقەکەوە.. هێندەی گەشت و سەفەرەکانی سیندباد و بگرە زیاتریش؛ هەر لەم ژوورەدا.. هەر لەم جێگەیەدا.. لە چاونوقانێکدا لەم سەری دنیاوە گەیشتوومەتە ئەو سەری و بەشداری چەندەها داستانی سەیر و سەمەرە و سەرگوزشتەی ئەفسووناویم کردووە.

هەموو ئەو شتانەی کە بیری لێ دەکەمەوە؛ پاش ئاوێك، وێنەکانی بە بەرجەستەکراوی دەبینمەوە.. هەروەك ئەوەی بەڕاستی روویدات؛ گێژدە و سەرقاڵم دەکات.



بە تەواوی شەو داهاتبوو. بارەش لە شەوانی پێشوو زیاتر تەنگی بە هەموو لایەك هەڵچنیبوو. کزەبایێك کە تەماندەزانی لە کوێوە دێتە ژوور. گەمەی بە تیشکی مۆمەکان دەکرد.. هێندەی نەبرد، هەرسێ مۆمە گەورەکەی ئەملا و ئەولا و نێوەڕاستی ژوورەکەی کوژاندەوە.

وام هەست دەکرد، دەنگێك لەنێو سندووقەکەوە دێت، بەو مەبەستەش گوێم رادێرا و هیچم نەبیست... دواتر ئاڵوگۆڕێك لە رەنگ و بۆی سندووقەکەدا روویدا. لەو تاریکییەدا.. فەنەڕ ئاسا کەوتە درەوشانەوە و تیشك پەخش کردن، هێندی هێندی خەفە بۆوە و وێنەکان کەوتنە جووڵە و جموجووڵ.

یەك لە دوای یەك و بەم شێوەیە کەوتنە بەرچاوم:

{ناسماتێکی رەش دەگەڕاو.. رەوە کوللەبەری خۆرەتاویان گرتبوو؛ تا دەهات زیادی دەکرد.. زیاتر چڕ دەبوونەوە و کۆدەبوونەوە. جار جارە تۆپەڵ تۆپەڵ جیا دەبوونەوە پاشان تێك دەڕژان.. بە یەك ئاست و بە یەك ئاراستەدا تەکانیان دەدا؛ لەناکاو دادەبارینە خوار.. شێوەیەکی سەیر و سەمەرەیان هەبوو.. گەرچی بە هەموو شتێك لە کوللە دەچوون؛ بەڵام باڵەکانیان باڵە چۆلەکە بوو.. بۆیە کەمتر هەڵدەبەزینەوە.. بە باڵەفڕە ئەم چڵ و ئەو چڵیان دەکرد.. چییان دەکەوتە بەردەست تێکیان دەشکاند و دەیانغاشییەوە.

کوللەکان لە نزیکەوە فڕەی باڵیان دەهات و پێنەوابوو دزەیان کردبێتە نێو ژوورەکەم.. راست و چەپ خۆیان بەملا و ئەولادا دەکێشا؛ بە چەشنی مشك دەیانتریکاند.

بەڵام سەوزە گیایەك لە ژوورەکەدا نەبوو.. تا چڵ و پۆپەکانی تێك بشکێنن.. رەنگە لە درز و کەلێنی ژوورەکەوە ئاودیو بن و باخچەکە سەرووژێر بکەن؛ شینایی تێیدا نەهێڵن!؟

چەرخەکەم لە گیرفانم دەرهێنا و مۆمەکانم داگیرساند...

کوللەکان بەشێوەیەکی ترسناك زەینمیان تەنیبوو.. نەمدەویست بیانبینم و تێیان بڕوانم؛ هەربۆیە بۆ ساتەوەختێکی دیاریکراو نەمڕوانییە سندووقەکە.

پاشان هەروەك ئەوەی دەنگێك لە نزیکەوە بانگم بکات و پێم بڵێت:

((بڕوانە...))

سەرم هەڵبڕی و ڕوانیمە سندووقەکە..!؟

کەسانێك خاك و خۆڵی ناوچەکەیان، پاش فەلاکەتی هێرش و شاڵاوی کوللەکان سەروژێر دەکرد! هەروەك ئەوەی بە شوێن شتێکدا بگەڕێن؛ هیچ لەوە نەدەچوو ئاگایان لەو کارەسات و فەلاکەتە بێت.. کە بەسەریاندا هاتووە.

یان ڕەنگە بەدرێژایی ساڵانێك، چاوەڕێی فەلاکەتێکی وا بووبێتن؛ چاوەڕێی چەشنە ڕەوە کوللەیەکی لەم جۆرە بوو بێتن!؟

بەردەوام دەگەڕان و پاچ و بێڵیان لە عەرد گیر دەکرد و لە قەراغی ڕووە و قیبلەی عەردەکەوە، بۆ نێوەڕاستی عەردەکە شەقاویان دەهاویشت. یەکێکیان هاوارێکی لێ هەڵسا؛ بە هەموویان کەوتنە هەڵکەندنی عەردەکە و خاك و خۆڵیان بەم دیوو و ئەو دیوودا پەرش و بلاوکرد.. دواجار زنجیر و گوریسیان لە شتێکی نێوقوڕاڵایی عەردەکە گیرکرد، پاشان لە دوو کەڵەگایان بەست و لە بگرە و بەردە و هەنگامەیەکدا.. بە حاڵ گاکان دەچوونە پێش.

پاش ئەوەی پارچە شیشێکی نوێڵ ناسایان.. لەژێر شتەکە گیرکرد و زۆربەیان قورسایی خۆیان خستە سەر و سندووقێکیان هێنایەدەر.

ئیدی لە ماندووێتی و شەکەتیدا بە پشتدا لەسەر عەردەکە لێی ڕاکشان! ئەوەی کە ڕوویدا دەرگای غایەڵە و گومانێکی نوێی بۆ کردمەوە... سەیر و سەمەرەیە، هەر جارەی شتێکی جودا و جیاواز دەبینم.. بە تەواوی سەرم لێ شێواوە...

-وەلی سلیوە-و کتێبەکەی.. هێندەی تر دۆزینەوەی سەرە هەودای ڕاستییە پەنهان و حەقیقەتە شاراوەکانیان ئاڵۆزتر و جەنجاڵ تر کرد.



کات درەنگ بوو؛ هەرچۆنێك بوو.. راکشام و لەنێو تەپاوتل و گینگڵ دانی نێو جێگادا؛ پێڵووەکانم لێك نا و لەنێوان خەون و زیندە خەوندا.. قـەکانی پلکە — کەتیـ—م، بیرکەوتەوە!

هەردەم پێش گێڕانەوەی هەر بەسەرهاتێك، پەنجەکانی لە یەك خاڵدا کۆدەکردەوە.. لەنێو نێوچەوان و سنگ و ئەم لا و ئەو لای شانەکانیدا نیشانەی خاچی دەکێشا.. پاشان خاچەکەی ملی ماچ دەکرد.

لە یەکێك لە ئێوارەکانی پاییزدا.. لەو دەمەدا کە من منداڵێك بووم؛ لەنێو باخچەکەدا هەنارە هەڵتەقیوەکانم کۆدەکردەوە، دەنگی گەڵا مردووەکان، ئەو دەمانەی کە پێمان دەنان؛ یان ئەو کاتانەی کە بەردەبوونەوە.. ئیقاعێکی سامناکی هەبوو.

هەردووکمان لە یەك کاتدا هەڵڕێستەمان کرد.. هەروەك ئەوەی خەمباری مەرگەساتی کەسانێك بین؛ دۆش داماین... تەنها لەوەم بیستبوو، کە مەرگی گەڵا و گوڵ و دار و درەخت.. هاوشێوە و لێکچووی مەرگی مرۆڤ و بوونەوەرەکانە!؟

پێنج شەش هەناری باشم کردبۆوە، لەژێر پیرە چنارێکی تەنیشت جۆگەلەکەدا جێمهێشت.

دەستێکی بەسەرمدا هێنا و گوتی:

((کوڕی خۆم.. گوێڕادێری دایکی خۆت بە؛ دەزانم عەوداڵی لوغز و نهێنی سندوقەکەیت و کەس پێت ناڵێت.. با من راستییەکەیت بۆ بگێڕمەوە:

ئەو ماڵەی ئێرە تێیدا دەژین.. ماڵی کەسێکی ناوداربوو، لە زەمانی هەنگامە و بگرە و بەردەی کوشت و کوشتاری ئەواندا؛ خەڵکێکی زۆر شاڵاویان بۆ هێنان و ماڵ و موڵکیان داگیرکردن!؟... ئەم خانووەی کە ئێستا ئێوەی تێیدا دەژین.. ئاوا نەبوو؛ دە پانزە ژوور و هۆڵ و جێگەی خواپەرستی و تەنانەت عەمباری هەڵگرتنی دانەوێڵە و چەڵتووکیشی هەبوو، لەو دەمەدا ئێرە قەڵایەك بوو بۆخۆی.

تۆ باش تەماشا بکە.. گەرچی بەردی بناغەی زۆربەی دیوارەکانیشیان، لە بنەوەرا.. بە درێژایی سالآنێکی دوور و درێژ دەرهێنا و بردیان، بەلآم ژێرزەمینەکەی هێشتاکە ماوە.

پاش خاپوورکردنی مالّی ناودارەکە؛ کەسانێکی نەناسراو دارەڕا و حەسیر و هەلآش و مشەما و کا و قورە سووریان کردۆتە سەربان و سەری ئەو سێ لادیوارەیان پێگرتووە.. کە ئێستا ئێوەی تێیدا دەژین. دواتریش ئەم دەرگایەی ئێستایان بۆ کردووە.

کوڕەکەم ئەو دەمەی ناودارەکەیان کوشت؛ کەس و کار و بنەمالّە و دەست و پێوەندەکانی.. بەراست و چەپدا بلآوبوونەوە و پاشان ولآتیان جێهێشت و هەلّهاتن... لەو بگرە و بەردەیەدا (ئەوا)ی کچە بچکۆلّەی کەسە ناوداردکەیان جێهێشتووە.

پێم وایە (ئەوا) لە حەژمەت و لە ترساندا بە پەیژە تایبەتییەکەی سندووقەکەدا چووبێتە سەر و پاشان لەنێو سندووقەکەدا خۆی حەشار دابێت.

پاش ئەوەی بنەمالّەیەکی دەوارنشین، لەم دەوروبەرەدا نیشتەجێ دەبن. سندووقەکەیان دەکەوێتە بەرچاو.. بەو نیازەی کە بزانن چی تێدایە... هەولّی هێنانە خوارەوەی و شکاندنی قفلّەکانی دەدەن؛ بەلآم دەرۆستی هێزە شاراوەکانی نێو سندووقەکە نایێن.

نە قفلّەکانیان بۆ دەشکێت و نە سندووقەکەشیان بۆ دێتە خوار!! دیارە ئەم بزێوی و لاسارییەیان دەبێتە مایەی دەردەسەری و نەگبەتی بۆیان... نەخۆشییەکی کوشندە لەنێویاندا بلآودەبێتەوە؛ دەبێتە هۆکاری گیان لەدەستدانی ژمارەیەکی زۆریان، زۆر درەنگ لەوە تێدەگەن.. کە ئەو سندووقە سندووقێکی ئاسایی نییە و نەدەبوو دەستی لێبدەن.

پاشان دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە هەرچی دەرد و دوو و نەگبەتییەك هەیە و ئێخەیان پێدەگرێت.. لەنێو خودی سندووقەکەوە دێتە دەر؛ هەر بۆیە بە پەلە زنجیری تێدەئالێنن و دوو قفلّی دیکەشی لێ دەدەن.

بەلآم دیارە ئەمەش دادیان نادات و تەنها چارەیەکیان هەلّهاتن و جێهێشتنی ئەم ناوە دەبێت.

ئێوەش گەر دایکت بە بنەچە لە خێزانێکی دیندار و بە باوەڕ نەبوایە؛ ئەوە بێگومان چارەنووستان لە دەوارنشینەکان چاکتر نەدەبوو!...

بەڵام هەر چۆنێك بوو، لێرە مانەوە و هەر لە یەکەم ساتیشەوە باوکت شەك بەرانێکی کردە قوربانی، بۆخورد و مۆمێکی زۆری لە ژوورەکەدا؛ بە مەبەستی هێورکردنەوەی روحی پیرۆزی نێو سندووقەکە داگیرساند.

هێندەی من ئاگاداربووم؛ لە رۆژە پیرۆزەکاندا، رووی دەکردە سندووقەکە و دەپاڕایەوە.. دەگریا و فرمێسکەکانی خوڕ خوڕ بە چاوانیدا دەهاتنە خوار...

ڕەنگە هەر بۆیە تارمایی و روحی بەدبەختی کچەکە زەفەری پێ نەبردبێتن و لێتان گەڕابێت)).

هەندێك جار.. بەتایبەتی ئەو دەمانەی کە ناڕەحەت و بێزار دەبووم؛ ئەو دەمانەی کە هەستم بە شتێکی سەیر دەکرد!؟ شتێکی بە سام و سارد... ((ئەوا))م دەبینی؛ بە کراسێکی شیفۆنی سپییەوە.. هێور هێور.. لەسەرخۆ لە باخچەکەدا دەگەڕا.. کە دەمویست بیدوێنم، وەڵامی نەدەدامەوە و دووردەکەوتەوە، پاشان وەك سەرابی هاوینانی بیابانێکی وشك و برنگ لەبەرچاوەمدا ون دەبوو.

(ئەوا) سپی کەلانەیەکی پرچ لوول بوو، پرچەکانی بە چەشنێکی سەیر گرمۆڵە و بۆبوون؛ پێنەدەچوو هیچ کاتێك و بە هیچ کەسێك شانە بکرێن!؟

چاوەکانی گەورە و درشت بوون.. گلێنە رەشەکانی، وەك چاوی ماسییەکی مردوو.. ترووسکایی تێیدا نەمابوو.. نەدەجوڵا و پرتەی نەدەکرد.. هێز و تینت تێیدا نەدەبینی؛ وەك ئاگرێکی خەفەوە بووی ساڵانێك.. کە ژیلەمۆ تادیار و پەنهانەکەشی، زەمەن کردبێتییە سووتوو. ئاوا گلێنەکانی بەسەرهاتی ساتە بە سامەکانی مەرگێکی بە سوێیان بۆ دەگێڕایتەوە.

پلکە –کەتێ– پێش مردنی بە چەند رۆژێك، هەروەك ئەوەی خەڵەفابێت و لەیادی چووبێتەوە، کە بە چ شێوەیەك بەسەرهاتەکەی بۆ باس کردووم.

جودا و جیاواز لەوەی کە پێشتر بۆی گێڕابووەمەوە...

شتێکی دیکەی بۆ باس کردم و گوتی:

((با ڕاستییەکەیت پێ بڵێم.. لەنێو سندووقەکەدا کتێبێکی پیرۆز هەیە. زۆر لە مێژە بەدەستە مویارەکەکانی زاتێکی ناودار و ناسراو نووسراوەتەوە... هەرگیز، تەنانەت کەسە دیندارەکانیش نەیانوێراوە، سەری سندووقەکە بترازێنن و دەست لە کتێبە پیرۆزەکە وەردەن؛ جا چ جای ئەوەی کە بیخوێننەوە)).

لە وەڵامدا گوتم:

((بەڵام ئاخۆ کتێبە پیرۆزەکان.. بۆ خوێندنەوەی ئێمە نەکراوە؟!))

بە شپرزەییەوە تێیڕوانیم.. بە چەشنێك هەناسەی هەڵمژی، کە پێم وابوو دوا نەفەسی بێت و بمرێت!!؟

پاشان درێژەی دایە و گوتی:

((خوێندنەوە پیرۆزی شتەکان ناهێڵێت و لەناوی دەبات.. ماناکان دەسڕێتەوە و ڕاستییەکان دەشێوێنێت!... نەکەی دەستی لێ بدەیت.. گەر بتەوێت بە نیازی کردنەوەی دەستی لێ بدەیت؛ ئەوە دڵنیابە لەوەی کە بەردەبیتەوە.. دەستت دەشکێت.. ملت دەشکێت.. ئاگر لە جلەکانت بەردەبێ و وەك گۆشتی سەر مەقەڵی چز چز دەسوتێی!!؟... ئەو دەمە ئێمەش تووشی فەلاکەت و موسیبەتێکی گەورە دەکەی)).

تا پێم کرابا و بەپێی پێویست.. بە پەیژەکەدا سەردەکەوتە سەرێ و چوار دەوری سندووقەکەم پاك دەکردەوە. قفڵەکانی هێندە ژەنگیان گرتبوو؛ کە پێم وانەبوو، گەر کلیلەکانیشی بدۆزیتەوە.. بکرێتەوە!؟

زنجیر و بزمارە جۆراوجۆرە داکوتراوەکان، سندووقەکەیان کردبووە پارچەیەکی دیوارە بەردینەکە.

* * *

هەردەم لە شارۆچکەکەدا.. لە هەر کوچە و کوڵان و شەقام و پەنا و پارسارێکدا؛ دەکرا تیمێکی تایبەتی سەر بە مۆزەخانەی –ش– ببینیت.

جل و بەرگێکی زۆر سەیریان لەبەر دەکرد. لە جل و بەرگی ئەو کەسانە دەچوو.. کە بەرەو بۆشایی ئاسمان دەچوون.

چەکێکی تایبەتیان پێ بوو؛ گەرچی پێشتر خەڵکی ناوچەکە، نەیانزانیبوو کە ئەو دار عەسایەی کە بە دەستیانەوەیە، چەکە!؟

هەربۆیە پیرەمێردێکی شارۆچکەکە.. پاش ئەوەی نارازی دەبێت، بە داگیرکردنی خانووەکەی و هەڵکەندنی دار و دیواری.. سەرۆکی تیمەکە بە دار عەساکەی پیرەمێردەکە لە جێی خۆیدا سڕدەکات، سێ رۆژ و سێ شەو بێ ئاگا دەکەوێت.. دواتر بە ئاگا دێتەوە و سەر و سیمای هیچ کەسێکی بۆ ناناسرێتەوە.. لەو دەمەشەوە تا ئێستا وشەیەکی لە دەم نەهاتۆتەدەر.

گەرچی خەڵکی لەو دەمەوە لە تیمە تایبەتییەکە دەترسان و سڵیان لێ دەکردنەوە.. بەڵام ئەو دەمەی خۆیان گەیاندە لای من راشکاوانە پێم گوتن:

((تا ئێستا تەنها رێگەی کەسانێکی دیندار و بە باوەڕم داوە؛ کە بە مەبەستی زیارەت کردن بچنە ژووری)).

لەوەدابوو کە یەکێکیان دار عەساکەم لێ بەرز بکاتەوە.. دەنگە دەنگ و بۆڵە بۆڵی حەشامەتەکە، سەرنجی راکێشان؛ بۆ تاوێك لەو خەڵکە رامان، کە بەرەو لای من شەقاویان دەهاوێشت.

لەو ساتەوەختەدا جورئەتێکی سەیرم لە خەڵکەکەدا بینییەوە، کە پێشتر تیمەکە بە بەرچاویانەوە، سەدان کوپەڵە زێڕ و خشڵ و زیوی ژێر ئەو خاکەی، کە ئەوانی لەسەر دەژیان؛ دەرهێنابوو...!!! کەچی وەك ئێستا بۆی نارەحەت و نیگەران و دڵتەنگ نەبوو بوون!؟ هێندەی ئێستا، بەرامبەر بە تیمەکە کۆك و تەبا و یەکگرتوو، هەڵوێستیان یەکنەخستبوو.

دیارە کە باس هاتە سەر —سندووقە پیرۆزەکە— بێ ئاگایان جوڵەی تێدەکەوێت، هەروەك ئەوەی لە قووڵایی خەونێکدا بن؛ دەستبەرداری ترس و خۆفیان دەبن.

پێکەوە لە دەرامەوە ریزیان بەست، وەك کورسی پشت ستراتیژنیك سەرە دێر و بنە دێرەکانیان، لە دوامەوە دووبارە دەکردەوە.

سەرۆکی تیمەکە هەڵی دایەوە و گوتی:

((هیچ کاتێك نەمانویستووە، دەست لە موقەدەساتی ئێوە بدەین.. بە راستیش بۆ ئەو مەبەستە نەهاتینە ئێرە)).

پاشەکشەیان کرد و گردەکەیان جێهێشت.

هەموو هەوڵ و تەقەلاَیەکی تیمەکە؛ بۆ سرینەوەی مێژووی دێرینی شارۆچکەکە بوو.. چەندان گۆڕیان هەڵدایەوە، کە سەدان ساڵ بوو لە دوا مەنزڵگایاندا بە ئارامی راکشابوون. بەپێی بیر و باوەڕی ئەو سەردەمە.. مردوویان لەگەڵ بە نرخترین شتێك کە هەیبووبێت؛ لە زێڕ و گەوهەر و خەنجەر و شتی دیکە.. لە کوپەڵەیەکی گەورەی تەنوور ئاسادا جێکردۆتەوە و پاش قەپاتکردنی دەمی کوپەڵەکە.. بە خاکیان سپاردووە.

لەو شتە سەیرانەی کە تیمەکە دۆزیبوویەوە.. کەڵەشێرێکی زێڕ بوو، کە هێندەی کەڵەشێرێکی شامی باڵا و قەبارەی هەبوو.. هەروەك دواتر بیستمانەوە، بە پارەیەکی زۆر بازرگانێك لێی کڕیبوونەوە.

ئەوەی مایەی سەرنج و عاجبایەتیمان بوو.. ئەو کارەسات و رووداوانە بوو، کە بەسەر یەکە بە یەکەی ئەندامانی تیمەکەدا دەهات.

بەردەوام ئەندامەکانی تیمەکە دەگۆڕدران و هەردەم هۆکارەکەشی ئەو کارەساتانە بوون.. کە دووچاریان دەبوو.. جا یان دەستیان دەکەوتە ژێر تاشە بەرد، یان پێیان هەڵدەخزا و دەکەوتنە ناو چاڵە قووڵەکانەوە.

ئەوەی کەڵەشێرە زێڕینەکەشی دەرهێنابوو.. وەك باسیان دەکرد.. بە هەمان مەبەستی گەڕان و دۆزینەوە و دزینی شتە مێژووییەکان... لە شوێن و جێگەیەکی دیکەی دوور لە شارۆچکەکە، کەوتبووە نێو خم خۆرکێکەوە.

شوانێك بەچاوی خۆی ڕووداوەكەی بینیبوو. گوێی لە ناڵە و هاواری بوو بوو، ترس و خۆفی ساتەوەختەكانی گیانەڵا و مەرگی لەچاوە تۆقیوەكانیدا بینیبوو.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لێی نەچووبووە پێش و لەجێی خۆی نەجوڵابوو.

كەڵەشێرە زێڕینەكەش وەك دەیانگێڕایەوە؛ لە ڕۆژگارێكدا پیرۆزییەكی تایبەتی هەبووە. ئەگینا گەر دروستكردنی، بۆ ئەو مەبەستە نەبووبێت!؟ ڕەنگە دروستكردنی كەڵەشێرێك لە ئاڵتوون.. هیچ مانایەكی نەبێت!!

لەم شارۆچكە مێژووییەدا، هەردەم شوێنێك دەرووخێندرا.. جێگەیەك ژێر و بن دەكرا.. ئەندامەكانی تیمەكە، شتە بەنرخەكانیان هەڵدەگرت و ئێسك و پرووسكی مردووەكانیشیان؛ لە توورەكەی ڕەش دەنا و بە ئۆتۆمبێلێكی تایبەت، بەرەو شوێنێكی نادیاریان دەبردن!؟

پاش پاشەكشێ كردنی تیمە تایبەتییەكە.. خەڵكەكە هێواش هێواش بڵاوەیان لێكرد و سەرگردەكەیان جێهێشت. لەوەدا بوو، كە بچمە ژوور.. كاتێك دەنگی شێتە پیرێژنێكی شارۆچكەكە هاتە گوێم...

هێور هێور خۆی گەیاندە لام و پاش وچانێكی كەم خایەن زاری پەخش كردەوە و گوتی:

((پیرێ ئەشكەوتە گەورەكەی ئەو دیوی چیا بەرزەكەیان؛ بە (تی نێن تی) ئەقاندەوە؛ من بە منداڵی لەگەڵ خاڵمدا چوومەتە نێو ئەشكەوتەكە... دیوارەكانی هەمووی نووسین و ڕەسمی عەجایب عەجایب بوو.. نێو ئەشكەوتەكە هەر دەتگوت بازاڕی زەڕەنگەرانە.. كوپەڵەكان هێندە پڕ بوون.. چیت دەویست لە خشڵ و زێڕ.. لە دەمی كوپەڵەكانەوە هاتبوونە دەر. سندووقی گەورە گەورەی پڕ لە یاقووت و خشڵ و زیو، لە هەموو پەنا و سووچێكی ئەشكەوتەكەدا دەكەوتنە بەرچاوت. زۆر حەزم دەكرد، شتێك بۆخۆم هەڵگرم؛ بەڵام خاڵم ئاگاداری كردم و پێی گوتم:

((ئەكەی كچێ دەستی لێ بدەیت.. دەستت بگاتە هەر شتێك دەبێتە خۆڵ. بەڵام چەندت پێ خۆشە تەماشای بكە))...

ئەو دەمەی کە خاڵم سەرقاڵی سەیرکردنی شتێك بوو، بە هەڵم زانی و دەستم دایە ئەنگوستیلەیەکی زێڕ، کە لەسەر عەردەکە و کەمێك دوور لە سندووقەکانەوە کەوتبوو.

هێشتاکە تەواو هەڵمنەگرتبۆوە.. کە لە نێو پەنجەکانمدا دیار نەما و بووە خۆڵ...))

ئیدی نازانم.. بۆ پاش قسەکانی پیرێژنەکە؛ -وەلی سلێوە-م بیرکەوتەوە و کەوتمە غایەڵەی ئەوەی، کە تۆ بڵێی ئەویش ئەندامی تیمی مۆزەخانەی -ش- نەبێت!!؟ یان تۆ بڵێی ئەندامی تیمی وڵاتێکی دی نەبێت!؟...

تۆ بڵێی لە زمانی بەرد و تەمەنی بەرد تێبگات.. تۆ بڵێی مێژووی شتە کۆنەکان بخوێنێتەوە.. پەی بە نهێنی و پەنهانەکانی ببات و گرێ کوێرەکانی بکاتەوە؛ هەروەك چۆن منداڵە چەتوونەکان، بۆ عانەیەك.. گرێ کوێرەی فەقیانەکانی دایکیان دەکەنەوە.

* * *

# بەشی دووەمی دەستنووسەکە

پاش خوڕە بارانێکی دڵۆپ گەورەی یەك دوو سەعاتی، ئاستی خوڕە ئاو و سێلاو، شێتانە بەرزبووەوە و نەك هەر ماڵە نوێی و بینا یەك دوو نهۆمییەکان، ژێر ئاو کەوتن؛ بەڵکو بەرزترین منارە و قوللەش هێواش هێواش دیار نەما.

لافاوێکی بێ وێنە و فیلم ئاسا پێڕە دارەکانی لە بنڕا رادەتەکاند و مرۆڤ و ئاژەڵ و دارتێلی کارەبا و ئۆتۆمبێلە هەمە چەشنەکان و کەلوپەلە جۆراوجۆرەکانی ناوەوە و دەرەوەی دووکان و بازاڕ و ماڵەکانی سەر ئاو دەخست. ئەوەی کە رووی دەدا خنکانێکی بە کۆمەڵ و سڕینەوەیەکی بێ وێنەی شارۆچکەی نێو نشێوەکە بوو؛ مەرگەساتێکی ترسناك و تووڕەبوونێکی تەواوی ئاسمان بوو.

تا دەهات هەوردکان زیاتر چڕدەبوونەوە.. زیاتر تێکەڵ دەبوون. بەرزی ئاستی ئاوی شارۆچکەکەش، تا دەهات زیاتر زیادی دەکرد و پانتایی دەریاچە نوێیەکەشی فراوانتر دەکرد.

پەڵە هەورەکان.. کەمێك بەرزتر لە گردەکە و لەسەر ماڵۆچکە نوێیەکەی منەوە، بەرەو کەنار و نێو جەرگەی شارۆچکەکە تەکانیان دەدا و شوێن پەنجەی سەدان ساڵی مرۆڤەکانیان دەسڕییەوە.

بۆ دەبوو چێشتەنگاو ئەم خوڕە بارانە دابارێت و سەرتاپای شارۆچکەیەك غەمر بکات، دەریازبوون و قورتاربوونیش بکاتە ئەستەم و مەحاڵ!؟

پرسیارێکی بێ وەڵام و بێ مانا بوو.. هێندەی بێ مانایی رەوینەوەی دواتری پەڵە هەورەکان؛ پاش جێهێشتنی دەریاچەیەکی رەش چۆرە.

لەسەر گردەکەوە دەمڕوانییە دەریاچە لیتاوییەکە...

گەرچی سێلاو و لافاو شارۆچکەیەکی برد.. بەلام هێشتاکە پانتایەکی بەرچاوی سەرگردەکە و هێندەی گچکە دوورگەیەك وشکانی بوو.

ڕوانیمە خانۆچکەکە وەك خۆی مابوو.. باخچە و گوڵ و گوڵزارەکانیش جوانتر و گەشتر دەهاتنە بەرچاو و گەڵاکان سیحراوییانە دەلەرینەوە.

بە پێویستم زانی کە دەرگاکە بترازێنم و بچمە سەردانی سندووقەکە.

وەك هەمیشە دڵۆپە ناوەکان، بەرد شڕەکەیان تەڕکردبوو. بە چەند سەعاتێکی دڵۆپەکردنی ساپێتەکە. پێ دەچوو وێنەی تاووسەکە بە تەواویی سڕدرابێتەوە؛ کە جار جارە وەك تارماییەك دەهاتە بەرچاوم.

گەرچی سەرەتا پێم وابوو، کە هیچ شتێکی نێو ژوورەکەم نەگۆڕاوە.. بەلام هێدی هێدی و پاش تاوێك کە بە وردی سەرنجمدا. شوێن جێگەی کتێبخانەکەم گۆڕابوو. لەوە سەیرتریش، گۆڕانی چەشن و جۆری کتێب و بلاوکراوە و گۆڤارەکانی نێوی بوو. کۆمەڵی کتێبی نوێم کەوتە بەرچاو؛ کە تا ئەو کاتەش کتێبی لەو چەشنەم، نەبینیبوو.

ڕەنگی ژوورەکە وەك پێشتر نەبوو؛ کە دیارە وەبیرم نەدەهات، کە هیچ ڕەنگێکی هەبوو بێت! دیوارەکان بە ڕەنگێکی مەیلەو زەرد بۆیە کرابوون؛ کە هێشتاکە بۆیەکەی بە تەواوی وشك نەبووەوە.

بۆنی بۆن نارەقەی کەسێکم دەکرد؛ هەروەك ئەوەی ئەو کەسە ماوەیەك خۆی لێرەدا حەشاردابێت و پاشان ژوورەکەی جێهێشتبێت و ڕۆیشتبێت!؟

بۆ جارێکی دیکەش ڕوانیمە بەرەکەی ژێر سندووقەکە، بە تەواوی بووبووە شتێکی تر و شوێنەواری وێنەی تاووسەکەی بە هیچ شێوەیەك پێوە نەمابوو.

بەلام سندووقەکە هەروەك خۆی بوو، ڕەنگ و جێگە و شوێنیشی نەگۆڕابوو.

ئەو دەستانەی کە ئەویان لەو جێگەیەدا قایم کردبوو؛ دڵنیابوون لەوەی، کە هیچ کاتێك هیچی لێ نایێت.



بە مەبەستی بینینی دوا دیمەنی شارۆچکەکە؛ چوومە دەر... لەژێر تیشکی خۆرە تاوێکی شەرمندا، هەروەك ئەوەی بە ئاگابێت لە کارەسات و بەسەرهاتی شارۆچکەکە؛ مەوداکانی بینین و تەماشام رەهاکرد و باڵندە ئاسا لە گردەکەوە تا پێی کرا، چووە تاقی ئاسمان.

چەند جارێك باڵە خۆڵەمێشییەکانی لە تیشك و پەخشانی خۆرە تاوەکە وەردا و لەسەر نزیکترین چڵ و پۆپی گوڵەباخێکی نێو باخچەکە نیشتەوە؛ بە پەلە پروزێ چەپڵەیەکم لێدا و هەڵمفڕاند.

دەبوو شارۆچکەکە ببینم.. ئەویش لێم دەبووە لەمپەر و کاتێکی زۆری لێ بە فیڕۆدام.. ئەم چڵ و ئەو چڵی دەکرد و پاشان لە بەرزترین لقی دار چنارەکەدا خۆی عاسی کرد، دەبوو هەڵیفڕێنم و دوا دیمەنی شارۆچکەکەی پێ ببینم...

ئیدی هەر چۆنێك بوو.. پاش ئەوەی تووشی دڵەڕاوکێ و بێزاریی کردم.. بەپێی ویستەکانم لە شەقەی باڵیدا و شینایی ئاسمانی تەی کرد و کە گەیشتە سەر شارۆچکەکە لە رەنگێکی شین بەولاوە هیچی دیکەم نەبینی.. ئاسمان هەموو شتێکی هەڵلووشی بوو.

ئەمدەزانی حەقیقەتە یان سیحری ساتەوەختێکی پڕووکاو!؟

لەنێو خۆمدا کەوتمە غایەڵە و پرسیار کردن؛

((کوا شارۆچکە دێرینەکە.. بۆ نایبینم و نایدۆزمەوە.. دەبێت چۆن ئەو سێڵاوە قوڕ و لیتاوییە رەنگی خۆی لەدەست دابێت و ئەم دەریاچە شینەی لەپاش خۆی جێ هێشتبێت؟!

خۆم بە کەشتییەوانێك دەهاتە پێش چاو؛ کەپاش تێکشکانی کەشتییەکەم لەم دوورگەیەدا جێ مابێتم.

لەوەتەی هەبووم، هەر تەنیا بووم؛ لە ئێستاشدا لەهەموو کاتێك زیاتر، تەنیا و بێکەس بووم و تا دەهات شەپۆلەکان زیاتر ملیان دەنا و خۆیان لە پەرژینی باخچەکە هەڵدەسوو.

دەریاچەیەکی شین و بێ مانا.. دەبێت کەی جەستەی خنکاوەکان سەر ئاو بکەون و بەڕاست و چەپدا شەپۆڵەکان بیانگێڕن!؟

لەوە دەترسام شەپۆڵە شێتەکان، جەستەی ژمارەیەکی زۆر لە خنکاوەکان؛ بەرەو کەناری دوورگەکە بهێنن. هەموو پانتایی دوورگەکە بە تەواوی جێگەی سەد مەردووی تێیدا نەدەبۆوە؛ جگە لەوەی کفن و دفن و ناشتنیشیان.. کارێك بوو لە توانا و وزەی من بەدەر و بە تەنیا و لەم دوورەدەستیەشدا بە هیچ کلۆجێك دەرۆستی نەدەهاتم پێش نەدەچوو.. بەو دەم و دەستە، هیچ جۆرە ماسی و زیندەوەر و دەعبایەك لەنێو دەریاچەکەدا پەیدابوبێت؛ تا لاشەکان بخوات و لەناوی بەرێت.

ڕەنگە باڵندە گۆشتخۆرەکان، لە ئاسمانەوە بیانبینن و بگەنە سەریان.. بەڵام ئەستەمە بتوانم بڕوانمە پارچە پارچەکردن و ریشاڵ ریشاڵ کردنی هیچ کەسێك؛ جا چ جای گەر ئەو کەسانە ناشنا و نزیکم بن.

لە هەموو کاتێك زیاتر تەنیا بووم و پێم وابوو ئەوەی کە دەیبینم؛ تەنها سەرابێکی ساتەوەختێکی تەماشا بێت. پەردەیەك بێت بۆ شاردنەوەی کارەساتێك؛ کە دەستەوەسان و بێچارەم بەرامبەری.. نەدەکرا بە فریای ئەو خەڵکەوە بچم، کار لەوە گەورەتر و بە سامتربوو!؟



دەمێك بوو بە سەرسامییەوە دەمڕوانییە دەریاچەکە، بە تەواوی لە سندوقەکە ترازابووم؛ ئیدی کەسێك لەو دەوروبەرە نەمابوو کە سندوقەکەی لێ بپارێزم.

کەسێك نەمابوو، تا بێتە زیارەتی و بپاڕێتەوە.. ڕاز و نیازەکانی دڵی هەڵڕێژێت و بەسەرهاتی خۆی بۆ بگێڕێتەوە.

تۆ بڵێی نەك هەر ئێرە؛ بەڵکو هەموو دنیا لە یەك ساتدا ژێر ئاو کەوتبێت و من لێرەدا بە تەنیا جێ مابێتم.. تۆ بڵێی بە سایەی سەری سندوقە پیرۆزەکەوە ڕزگارم بووبێت!!؟

زۆرجار دوورگەکەم لی دەبوو، کەشتییەکی سەرتاوکەوتوو، کەشتییەك کە هیچ ناراستە و جێگەیەك نەبوو، رووی تێ بکات و بۆی بچێت. پێشتر لە دوو تویی کتێبەکانەوە عاشقی دەریا بوو بووم.. هەردەم ماجەرای کەشتییەوانەکانم دەخوێندەوە و پێی شاگەشکە دەبووم.

سەرگوزشتە سەیر و سەمەرەکانی سندباد و بەسەرهاتی تەنیایی –رۆبنسۆن کرۆزۆ– و دوورگەکەی؛ زۆر سەرقیان رادەکێشام.

هەردەم بە دزییەوە، دوور لە تەماشا و تیژوانینی سندووقەکە، بە خەیاڵ لە نێو دوورگەکدا رامدەکرد.. بە دارگوێزە هێندییەکانیدا هەڵدەگرام.. لەسەر لمی کەنارەکەی لێی رادەکشام.

گەرچی چواردەوری سەرگردەکە، دەریاچە بوو، بەڵام نەدەکرا وەك هەر گچکە دوورگەیەکی دیکەی دنیا تێی بروانێت!؟ نە باڵندەی رەنگاورەنگ و نە ئاژەڵی سەیر و سەمەرە و نە رووەکی دەگمەنیشی تێدا بوو، بە تەواوی گچکە دوورگەیەکی جیا و جودا و بێ دەنگ و کپ بوو.

پێڵووەکانم قورس بوو بوو.. ماندوو و شەکەت بە مەبەستی خەوتنێکی قووڵ، دەرگای ماڵۆچکەکەم ترازاند و بێ سێ و دوو، خۆم لە ژێر لێفە چلکنەکە نا و وەك هەر ساتێکی پێش خەوتن؛ چەند دێرێکم دووبارە کردەوە و دواتر پێڵووەکانم لێك نا و خەوتم.



ئەو دەمەی کە وێنە و دیمەنەکانی رابردووی خۆم و کەسانێکی ترم دەهاتە پێش چاو؛ پێم وانەبوو کە بە تەواوی بێدار بوویتمەوە.

ساتە بەسەرچووەکانی منداڵی –ئەوا–م دەهاتە بەرچاو؛ لە باخچەکەدا دەگەڕا.. لەژێر دار چنارەکەدا رادەکشا.. کیسەڵە بچکۆڵەکانی لە ئامێز دەگرت.

پاشان کیسەڵەکانی دەخستە نێو کولانە لاچەپەکەی مریشکان و دوای چەند رۆژێك پاش ئەوەی لە ترسی مریشکان.. سەریان لە قاوغەکانیان نەدەهێنایە دەر؛ مردار دەبوونەوە.

پاشان –نەوا– کیسەڵە مردارەوە بووەکانی دەردەهێنا و بۆیان دەگریا.. شین و ماتەمی بۆ دەگێڕان، پرچی خۆی دەرنی.. چنگی لە کوڵمە سپییەکانی گیردەکرد.. گازی لە پەنجەکانی دەستی دەگرت.. خۆی بەدار و بەرددا دەکێشا و پاشان لە پەنایەکدا خۆی مەڵاس دەدا.

باوکی کە دەهاتەوە.. بە قسەی خۆش و بە هێمنی بانگی دەکرد؛ سەری ماچ دەکرد.. کوڵمەکانی رادەمووسی.. ناوچەوانی دەشێلا.. پرچەکانی بۆت دەکرد.. پەنجەکانی دەژمارد.. لە بەژن و باڵای دەڕوانی.. پارەی لە بەرکی دەردەهێنا و دەیدایێ، بە پەلە باڵندەیەکی بۆ پەیدا دەکرد و دەیدایە دەست –نەوا–؛ بۆ تاوێك کیسەڵەکانی لە بیر دەچۆوە.. شاپەڕەکانی هەردوو باڵی باڵندەکەی دەژمارد و لە پەڕەکانی کلکی ورد دەبۆوە.. بەدەست خواردنی دەدایێ، ناوی لە زاری دەنا، ماچی دەکرد.

باڵندەکە لەم کەین و بەینەدا یان خۆی قورتار دەکرد و لە شەقەی باڵی دەدا.. یان لەنێو دەستی –نەوا–دا مرداردەبۆوە.

پێم وانەبوو کە بە تەواوی بێدار بووبێتمەوە؛ نەوەدەمەی کە دەمووچاوی خوێناوی پیاوە ناودارەکەم بینی، لە تەمتوومانی سەر شارۆچکەکەی دەڕوانی.. نەیدەزانی کە پاش تاوێك چوار زرتە زەلامی تێکسمڕاو دێن و بەگوریسێك دەست و قاچی شەتەك دەدەن، نەیدەزانی کە راکێش راکێش بەسەر بەدەڵان و زیخ و و چەودا رایدەکێشن.

نەیدەزانی پاش ریشاڵ ریشاڵ بوونی جەستەی؛ شەو و رۆژێك سندرقەکە خوێنی لەبەر دەڕوا!!؟ دواتر چەند وێنەیەکی یادەوەرییە تەڵخەکانی منداڵیم لە بەرچاودا روون بۆوە:

{دایکم لەبەر دەرگا لیفکەی دەچنی.. سارایەکیش لەنێو بێشکەدا و لەبەر خۆرە تاوێکی بەهاردا. بێدەنگ گەمەی بە گوڵنگە و دوعا و ملوانکە و تەزبیحە هەڵواسراوەکان سەروخۆی دەکرد... تولێکی رەنگاوڕەنگی گوڵدار بێشکەکەی داپۆشیبوو.

باوکم بە تەورداس وشکە دارێکی دەبڕییەوە.. کۆمەڵێ منداڵ لەودیوی گردەکەدا، راکە راکە و گەمەیان دەکرد.. پێدەکەنین و هاواریان دەکرد.

باپیرم بە پێوە راوەستابوو.. گۆچانەکەی لە عەرد گیرکردبوو. فەقیانە سپییەکانی شۆڕکردبوو.. پشتێنە پانەکەی تووند بەستبوو. سەعاتە کۆنەکەی بە چاکەتی مورەخانییەکەی هێنابە دەر و تێبڕوانی...}.

بۆ ساتێك وێنەکان بێ جوڵە، لەجێی خۆیان راوەستان! سەیرکردنی چەند وێنەیەکی ناوا، لە ناوەوە نازاریان دەدام، نۆقرەیان لێ بڕیم.. دەبوو وێنەکان ببزوێن و بگۆڕێن؛ نەگینا هەناوم وەك جامە ناوێکی کولاو دەکەوتە قوڵپ دان و بێهودەیش وەك چینە هەڵمێکی بەرزبۆوە.. بینایی لێڵ دەکردم.



لەبەر بەرۆچکەیەکی یەتین و بەتاودا.. لەژێر دار چنارەکەدا، بەرامبەر بەو دەریاچەیەی کە شینایی ئاسمان ناوێزانی بوو بوو؛ دانیشتبووم. کتێبەکەی —وەلی سلێوە—م بە دەستەوە گرتبوو.. بالای بەرزی.. قامکە درێژەکانی.. ددانە سپی و درشتەکانی.. خەندە و بزەی شاراوە و بە شەرمیم دەهاتە بەرچاو.

تۆ بڵێی لە چ وڵاتێکەوە گەیشتبێتە ئێرە؟! تۆ بڵێی کەی بێتەوە و بەرێزەوە دەرگاکە لێبدا و تکایەکی زۆر بکاتە پردی پەڕینەوە و هاتنە ژوورەوەی.

دواتریش سندووقەکە وەك جەستەی نازیز و کەسێکی نزیکی بلاوێنێتەوە و بگری؛ سەردوولکەی بۆ بخوێنێتەوە و حەکایەتە نەفسووناوییەکانی بۆ باس بکات.

هیچ کاتێك راستەوخۆ تێی نەدەڕوانیم.. هەردەم سەیری شوێنێکی تری دەکرد؛ لەگەڵ ئەودا دەدوا و زیاتر ئاماژە و دەستەکانی دەبزواند.

ماوەیەك بوو لە خەونەکانمدا؛ لەگەڵ —ئەوا— دەمبینین.. وەك کچی خۆی لە ئامێزی دەگرت.. حەکایەتی بۆ دەکرد.. گەمەی لەگەڵ دەکرد؛ پاشان وەك پەیکەرێکیان لێ دەهات و رادەوەستان.

زۆر رکم لەو ساتانە دەبۆوە؛ کە وێنەکان تێیدا دەوەستان و دیمەنەکان نەدەچوونە پێش. بەڵام جارێکیان هەمان ساتەوەختی راوەستانیانم، بەشێوەیەکی دیکە بینی، کە پێ نەدەچوو راوەستابێتن!؟ فرمێسکەکانیان دڵۆپ دڵۆپ دەهاتە خوار و جۆگەلەناسا رێچکەی دەبەست و لە دیراوی باخچەکەدا ون دەبوو. یەکێك لەو نەورەسانەی کە دیار بوو.. تازە ئەم دوورگەیەی دۆزیبووە. لەسەر شانی -وەلی سلێوە- هەڵنیشتبوو، بە دەنووکەکانی روومەت و چاو و لووت و گوێی ئەوی دەکوتییەوە.. بەڵام هەروەك ئەوەی تاتە بەردێك بێت.. لەجێی خۆی نەدەبزوا!!؟

لەو کاتەدا بەردێکم گرتە نەورەسەکە و هەڵمفڕاند؛ نەبا چاوی دەربێنێ.

رەنگە -وەلی سلێوە- لە رۆژگار و زەمانێکدا لێرەدا ژیابێت؛ یان رەنگە کەسێکی ئەو، لێرەدا ژیابێت. بەڵام ئەو بۆخۆی لە نزیکەوە بە سندووقەکە ئاشنا بوو، ئەو کتێبەی کە جێشی هێشتبوو، بێ مەڵامەت نەبوو!؟

لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسرابوو: (نووسینی: و. س. د)... بەرگەکەیم هەڵدایەوە و پاش یەك دوو لاپەڕە وێنەی نووسەرەکەی تێیدابوو؛ کە بە تەواوی لە -وەلی سلێوە- دەچوو.

تەنها جیاوازییەکیش لە نێوانیاندا؛ وێنەکە بیست سی ساڵێك لە ئێستای -ئەو- بە تەمەنتر دەهاتە پێش چاو.

لە دەفتەری یادەوەرییەکاندا...

کە جار جارە شتێکم تێیدا دەنووسی؛ ئەم دێرانەی خوارەوەم نووسی:

{لە ساتەوەختی ئێوارەیەکی پاییزدا، چاوم بە دنیا هەڵهێنا. هەر لە منداڵییەوە خەون و زیندە خەونەکان، لە سەدان پەنجەرە و دەرگای جۆراوجۆرەوە.. دەهاتنە نێو ناخی پەست و گۆشەگیرم.

لەو جێگەیەی کە تێیدا جێیان دەهێشتم، نەدەجووڵام و نەدەبزوام، خۆم دەدایە دەست تەوژمی خەونە جۆراوجۆرەکان.

بۆ خۆشم دەبوومە بەشێکی خەونەکان و لەگەڵ کەسایەتییەکانی نێو خەونەکاندا دەدوام و تەگبیرم بۆ دەکردن.

لای من دنیا بریتی بوو، له خەون و حەکایەتە جۆراوجۆرەکان... بریتی بوو لەو خەونانەی کە کەسانێکی تێیدا دەناسێت.. دواتریش بە واقیعی لە ژیانی رۆژانەدا، ئەو کەسانە بە تووشتەوە دەبن؛ هەروەك چۆن لە خەونەکاندا دەیانبینیت.

هەردەم خەون وەك سەگێکی نهێنگر.. قەپی لە پوزم دەگرت و لەگەڵ خۆیدا رایدەپێچام و نەختەبووت ناسا پەلەکانی تێدەناڵاندم و رایدەکێشامە نێو قووڵاییە بێ بنەکانی دەریاچەیەکی مەجهول.

هیچ کاتێك خەونە لینجەکان، دەستبەردارم نەدەبوون.. شەوانە، مۆتەکە ناسا هەناسە سوار و شەکەتیان دەکردم، ئیدی نەمدەزانی کێ گوێی لە هاوار و ناڵە و نرکەمە!؟

کام دەرگا دەترازێ و کام دەروازە کلۆم دەدرێ...

کۆڵان و کوچەکانی نێو ناخی زامدارم، هێندە تەسك و ترووسك و بە پێچاوپێچ و تێکەڵ و پێکەڵ بوون.

دۆزینەوەی شارێگەی سەرەکی ئەستەم و مەحاڵ بوو.. خەون بینینم دەرد و نەخۆشییەکی نەبەدی بوو!!؟}.

ئەو کتێبەی کە —وەلی سلێوە— بۆی جێهێشتبووم، هەردەم لە شوێنێکی ژوورەکەمدا جێم دەهێشت. بەڵام دواجار لە ئێوارەیەکی درەنگ وەختدا، لە کەنار دەریاچەکەدا جێم هێشت.

ئیدی نیوەشەو وەبیرم هاتەوە.. راچەنیم و لە جێی خۆم راسام.. دەرگاکەم کردەوە و تا کەنار دەریاچەکە رانەوەستام.. گەرچی مانگەشەو بوو؛ بەڵام کتێبەکەی —وەلی سلێوە—م نەدۆزییەوە و پێم وابوو شەپۆلەکان جێگۆڕکێیان پێکردبێت و پاشان هێندی هێندی رایانکێشابێتە نێو قووڵایی دەریاچەکە، یان رەنگە ئەو رەشەبا توندەی، کە لەو شەوەدا لوورەی دەهات؛ کتێبەکەی پەڕە پەڕە کردبێت و هەر پەڕەیەکی بەلایەکدا بردبێت، یان لەوانەیە کتێبی لەو چەشنە، لە بنەڕەتدا بوونی نەبێت و تەنها لە زەینمدا قەتماغەی بەستبێت!؟ رەنگە —وەلی سلێوە— و کتێبەکەی تەنها بەشێك بن لە —خەون بینینم—!؟

هەرچۆنێك بیرم لە —وەلی سلێوە— و کتێبەکەی دەرکردەوە.. لە چ خاڵێکەوە دەستم پێ دەکرد، دواتر دەچوومەوە سەر هەمان خاڵ.

بەڵام گەر —وەلی سلێوە— لە راستیدا بوونی هەبێت!؟ بێتەوە و داوای کتێبەکەی بکات.. ئەو دەمە چی بڵێم و چۆن چۆنی باسی کەمتەرخەمی بۆ بکەم!؟

چۆن چۆنی ئەوەی تێبگەیەنم، کە نەمتوانی تەنها کتێبێك بپارێزم!؟ شێر و رێوی چی بۆ بهێنمەوە.. لە کوێوە دەست پێبکەم و لە کوێدا هەڵوێستە بکەم.. بێگومان لێم زیز دەبێت و پێم دەڵێت:

((کتێبەکەت بۆ هێنایە دەر؛ دەکرا لەنێو ژوورەکەدا بیخوێنیتەوە. هەروەك چۆن پاسەوانێکی دڵسۆزی سندووقەکەی؛ دەبوو ئاواش پاسەوانێکی دڵسۆزی کتێبەکە بوویتایە!؟

دیارە شەیتان فریوی داویت.. تۆ چۆن سۆفی و پیاو چاکێکیت!؟ چۆن ئەولیا و دیندارێکیت!؟ کەنار.. دەریاچە.. باڵدانەوە، بەتۆ چی؟! لەم دنیا فانییەدا، دەتەوێت لەچی رابمێنیت!؟ گەورەترین موعجیزە و بەهاکانی جوانی، لەنێو ژوورەکەتدایە.. ئیدی چ ئیشێکت بە هاتنەدەر و تێرامانە!!؟ دەبوو کاتت بە فیڕۆ نەدابا و ساتەوەختی ئێوارانت لە خواپەرستیدا بەسەر بردبا...

دەبوو تەنها روحی پیرۆز و سندووقی پیرۆز و ژووری پیرۆز و دووڕگەی پیرۆزت، لا گرنگ بووبووایە و نەتڕاوێنیایە ئاسۆیەکی بێ مانا؛ خۆت بە دەریاچەیەکی بێڕەنگەوە سەرقاڵ نەکردایە!؟ نابینیت کە نە باڵندەکانی لە باڵندە دەچن!؟ نە ماسییەکانیشی لەماسی!؟ ئەوەی کە دەیبینیت و پێوەی سەرقاڵی.. تابلۆیەکی کاڵ و کرچی وێنەکێشێکی نەزانە!؟

رەنج بێوەرت کردم...

تۆ نازانیت چی لەنێو ئەو کتێبەدا هەبوو.. تەنها بە یەك ئاراستەدا دێڕەکانت خوێندۆتەوە.. بەڵام گەر بەپێچەوانەوە بتخوێندایەتەوە، ئەوا بە ئاسانی لە ناوەڕۆکی کتێبەکە حاڵی دەبوویت.

سالآنێکی دوورودرێژی تەمەنی خۆم، لەپێناو دۆزینەوەی ئەو کتێبەدا بەهەدەر دا تاڵە ئەشکەوتێکی عاسی و دوورە دەستدا، دۆزیمەوە. گەر تۆ کتێبەکەت نەفەوتاندایە.. ئەوە چاوەڕێی هاتنی زاتێکی پیرۆزمان دەکرد. دەهات و کتێبەکەی لێ وەردەگرتی.. دەیخوێندەوە و پاشان قفڵەکانی سندووقە پیرۆزەکەی، یەك لە دوای یەك بە کلیلێکی شاراوەی نێو بەرگی کتێبەکە دەکردەوە...)).

پرسیارەکان، بە چەشنی پەچەهەنگی لە پوورە ترازاوی بەهاران، ئۆقرەیان نەدەگرت و کونەدار و پەنا و پاساری وەلأمەکانیان تەی دەکرد!؟ لەشوێنێکدا بۆ شتێك دەگەران.. بە شوێن وەلأمی ئەو پرسیارانەدا وێڵ و عەوداڵ بوون؛ کە لەنێو هەمبانەی مێشکەکەدا جمەی دەهات، بەچەشنی رژچوونی دەستی منداڵێك بۆ نێو شلە هەویرێك؛ رۆچووبووە نێو ئەو ئەندێشە خۆڵەمێشیانەی، کە بووبووە بەشێکی سندووقە سەرم و پێدەچوو ساتەوەختی داماڵینی؛ ساتەوەختێکی ئەستەم و ئەزۆك بێت.



هەروەك ئەوەی کە بەڕاستی سەرکۆنە کرابێتم!!؟

مات و مەلول لە دەرەوە و لە پەنایەکی ژوورەکەمدا دانیشتبووم. نەمدەویست سەرهەڵبڕم و تەماشای شتەکان بکەم. لە عەردەکەم دەڕوانی و بە چیلکەیەك رێگەم لە قالۆنچەیەکی رەش دەبەستەوە.. سەرم لێدەشێواند، پاش ئەوەی هەموو رێگەکانی هەڵهاتنم لێ دەبەستەوە.. بێ هیوا دەبوو؛ پاشان تاکتیکی دەگۆڕی و لە جێی خۆی رادەوەستا و خۆی مت دەکرد.. کە پەلەپێتکێم لێ دەدا، خۆی بە پشتا دەخست و جووڵەی نەدەکرد و نەدەبزوا.

فێڵ و تەڵەکەبازیی ئەو مێرووە بچکۆڵەیەم بەلاوە سەیر بوو!؟ بە پەقەکەڵە و پەقەی شایەتمان، ئەم لا و ئەولایم بە ناسکی گرت و هەڵمگێڕایەوە و لە دۆخی سروشتی خۆیدا جێم هێشت.. هیچ جووڵەیەکی بۆ نەکرد.. نەدەکرا بەڕاستی

مردبێت!؟ چونکە هیچ هێزێکی ئەوتۆم لە گرتن و گەمە پێکردنیدا بەکارنەهێنابوو؛ سەرباری ئەوەش مێرووریەکی لەش بە قاوغ و تۆکمە و پتەوبوو. تا قارغەکەی نەشکێنێت و هاتنە دەرەوەی شلەمەنییە شینباوەکەی نێوی بەچاوی خۆی نەبینێت، زەحمەتە دڵنیا بێت لە مردنی!؟

پاش تاوێك، کە روانیمە شوێن جێگەی قالۆنچەکە و لێی ورد بوومەوە.. لەوێدا نەمابوو. ساتەوەختی غەفڵەت و سەرقاڵیمی قۆزتبۆوە و بە پەلە خۆی لە درز و کون و کەلەبەرێك نابوو، نەمویست بەشوێنیدا بگەڕێم و چیلکەکەم فڕێدا.

گەندەپەری کۆترە شینکەیەك، لە باوەشمدا گیرسایەوە...

روانیمە ژێر گوێسە بانەکە؛ لەنێو داردرا و هەلآشەکاندا دوو کتۆ هێلانەیان کردبوو.. گەمەگمیان گوڕوتینێکی لە ناخمدا بزواند و وەك سیسە گیایەکی پاش باران بووژامەوە.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((خۆزیا ئێمەش باڵندە بووینایە.. بمانتوانییایە لە شەقەی باڵ بدەین و لە بەرزییەوە بڕوانینە شتەکان.. جێگەشمان وەك باڵندە جۆراوجۆرەکان؛ سەردار و گومەز و منارە و ژێر گوێسە بانە و پەنا و پاساران بووایە!!؟)).

لە رۆژە سارد و تەڕ و تووشەکاندا؛ ون دەبن و خۆیان دەشارنەوە و چاوەڕێی نەختە خۆرە تاوێك دەکەن، تاڵە مابەینی هەورەکانەوە سەرە تاتکێیان لەگەڵ بکات و بانگیان بکات؛ پێیان بڵێت.. وەرنە دەر و خۆتان لە چاڵە تاوەکان وەردەن؛ باڵەکانتان گیف بکەنەوە و بە دەندوك شاپەڕ و گەندەپەڕەکانتان رێك بخەن.. بخریوێنن و با دەنگی خوێندنتان وەك هارە و هاژەی تاڤگەیەك گوێی بنیادەمەکان کاس بکات.

چاوم بەرز کردەوە و ڕوانیمە پانتاییەکانی ئاسمانی شین و هەوداکانی دەریاچەکە.. ماسیگرەکان بەلەمەکانیان بە دووی یەکتردا سەوڵ دەدا.. لەوە دەچوو پێشبڕکێ بکەن؛ یان بە پەلە بیانەوێت، بگەنە کەناری دەریاچەکە.

قاڕە و قاژەی قاز و قولنگ.. سەرنجی هەردوو ماسیگرەکەی ڕاکێشا و کەمێك ڕاوەستان و پاشان هەروەك جاران کەوتنە سەوڵ لێدان.

نازانم بۆ لەو ساتەدا شارۆچکە ژێر ئاو کەوتووەکەم وەبیر کەوتەوە!!؟

خەوتبووم و خەونم دەبینی؛ نەودەمەی دەرگاکە بە توندی لێدرا و بە ئاگا هاتم. بۆ تاوێك لە جێی خۆم نەبزوام و وەدووی سەرە هەودای خەونەکە کەوتم.

لە خەونەدا:

لە شارۆچکەیەکی وشك و برنگدا بە شوێن قومە ئاوێکدا دەگەڕام.. دەرگاکانم دەکوتی.. بەنێو لاشەی مرۆڤە کوژراوەکاندا هەنگاوم دەنا. تەنها بیرە ئاوێك کە دۆزیمەوە و گەیشتمە سەری؛ لاشەی منداڵێکی تێدا بوو.. ئەو زامدارانەی کە هێشتاکە گیانیان نەدابوو؛ تا دەگەیشتمە سەریان، گیانیان دەدا و دەمردن.

نیو بە نیوی کوژراوەکانم ژمارد و دواتر ژمارەکەم لێ تێك چوو!؟ نەدەکرا دەست پێبکەمەوە و سەر لەو نوێ بکەوەمەوە ژماردنیان.

تینوو و شەکەت؛ شەڵاڵی ئارەقەیەکی خەست بوو بووم.. ئاراستەکانم لێ تێکەڵ دەبوو.. کوچە و کۆڵانەکانم بە ئاسانی نەدەناسییەوە.

یەکێك لە کوژراوەکان لە هەموو کۆڵانەکاندا دووبارە دەبۆوە!؟

کە دەم و لووتی خۆی بە جامانەیەك، توند شەتەك دابوو.. پەیکەری منداڵێکی ساوای لە ئامێز گرتبوو.. ڕەنگێکی هەڵبزرکاو و ڕیش و سمێڵێکی ماش و برنجی و تێکەڵی هەبوو.

{لە شارۆچکەیەکی خۆڵاوی بێدەنگدا هەنگاوم دەنا، دەنگی هیچ بوونەوەرێك نەدەهاتە گوێ.. گەڵای درەختەکان جووڵەیان لێ بڕابوو.. قومێ ئاوم نەدەبینییەوە.. بەردەوام نەمسەر و نەو سەرم دەکرد.. دەرگای ماڵۆچکە نەوییەکانم دەترازاند؛ جامانە و پشتێنی جێماو.. پڕیاسکە و بوخچەی پێچراوە.. مەرکانە ئاوی ڕەش داگەڕاوم دەبینی!؟

لەبەر خۆمەوە هێندەم گوت:

((بۆ دەبێت.. هەموو پێکەوە گیانیان دابێت و مردبێتن!؟))

لەو دەمەدا، لە ئاسمانەوە دەنگی فڕە فڕی دوو ئامێری پەروانەدار دەهات کە پاش تاوێك، ژمارەیەکی زۆر لە بنیادەمی تێکسراو و دەماغکراو بە گوریسێکی تایبەت.. لە دەرگایەکی لاتەنیشتی ئامێرە پەروانەدارەکەوە هاتنە خوار.

ئیدی نەمزانی چوونە کامە ماڵ و شوێن و جێگا؛ لەکوێدا ئەو سندورقمیان وەچنگ کەوت.. کە لە سندووقەکەی نێو ژوورەکەی من دەچوو.

لە دوو لاوە گوریسێکیان تێ پێچا و پاشان هەڵیانکێشایە نێو ئامێرە پەروانەدارەکە و ئەوەی بە لاشمەوە سەیر بوو؛ گەرچی زۆر لە نزیکی ئەوانیشەوە وەستابووم.. بەڵام نەیاندەبینیم و هەستیشیان پێ نەدەکردم. هەروەك ئەوەی لەوێشدا نەبم!!؟} .



دەرگاکە بۆ جارێکی تر لێدرا. بە شپرزەیی هەستامە سەرپێ و چەرخەکەی گیرفانم دەرهێنا و هەرسێ مۆمەکەم داگیرساند. بە ئەسپایی خۆم گەیاندە پشت دەرگاکە...

پرسیم: ((تۆ کێی؟))

دەنگێکی مێینەم، کەوتە بەرگوێ؛ کە بە تەواوی وەکو ئێمە قسەی پێ نەدەکرا.. وشە باریك و قەڵەوەکانی تێکەڵ دەکرد. رستەکانی پاش و پێش دەخست.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((رەنگە –وەلی سلێوە– ناردبێتی!؟ بۆ دەبێت هاتبێتە ئێرە!؟ ئەو کێیە و چی لەمن دەوێت!!؟))

جارێکی تریش پرسیم: ((تۆ کێی؟))

ئەمجارەیان بە زمانێکی رەوان و پاراو وەڵامی دامەوە:

((هەر دەبوو بە شەو بێمە لات.. سپێدە ئێرە جێدەهێڵم؛ تا دەرگاکەم لێ نەکەیتەوە، ناتوانم هیچت پێ بڵێم...))

لە قسەکانی کەوتمە گومان و هەمان پرسیاری پێشووم دووبارە کردەوە و گوتم: ((تۆ کێی؟))

لە وەڵامدا گوتی:

((دەبێت سەبارەت بە شتێك لەگەڵتا بدوێم، ڕێگەم پێ بدە بێمە ژوور و ئەوەی کە دەیزانم...))

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((تۆ بڵێی ئەمەش بەشێك بێت لەو خەونەی کە پێشتر دەمبینی!؟))

لەبەر خۆیەوە بڵمە بڵمی دەهات و پەیتا پەیتا شتێکی دووبارە دەکردەوە.. تا دەهات دەنگی دەگۆڕا و پاش کەمێك، دەنگیم بە تەواوی وەك دەنگی نێرەمووکێك دەهاتە بەرگوێ.

بۆ دواجار هەمان پرسیارم دووبارە کردەوە و گوتم: ((تۆ کێی؟))

وەڵامی دامەوە و گوتی:

((تۆ بەشێکی لە خەیاڵەکانی من و منیش بەشێکم لە خەیاڵەکانی تۆ. چۆن من ناناسیت!!؟))

لە وەڵامدا گوتم: ((من تەنها —وەلی سڵێوە— دەناسم!؟))

پاش کەمێك بێدەنگی.. کەوتە قسەکردن و درێژەی دایە:

((بەڵام ئەو بەشێك نییە لە خەیاڵەکانی من و تۆ!؟ وەکو ئێمە بە منداڵی لەژێر سێبەری دار چنارەکەدا گەمەی نەکردووە و زەرنەقووتەی چۆلەکە پاساریەکانی لە عەرد هەڵنەگرتۆتەوە.. بە چەقۆیەکی کوول کلکی مارمێلکە بۆرەکانی نەبڕیوەتەوە و دووپشك و مارە زیندووەکانی لەنێو ژێلەمۆدا نەناشتووە...))

پێم وابوو کە ڕەنگ بێت، خۆم بۆ خۆم تۆنی دەنگی خۆم بگۆڕم و هەر خۆشم لەگەڵ خۆمدا بدوێم!!؟

لاپەڕە دوو سەد و دوانزەی یەکێك لەو کتێبە پیرۆزانەم دەخوێندەوە؛ کە دەمێك بوو لەنێو کتێبخانەکەمدا تۆز لێی نیشتبوو.. هێشتاکە بە تەواوی لە خوێندنەوەی لاپەڕەکە نەبووبوومەوە؛ کە دەرگاکەم بیرکەوتەوە.. هەروەك ئەوەی ئەڵقە گەورە ئاسنینەکەی لەربیێتەوە.. سەدایەکی سست و لەسەرەخۆ؛ هەروەك ئەوەی لەبن

عەردەوە دەنگی بێت.. بە نیقاعی زەنگی کڵێسایەك دەهاتە گوێم.. پاش سێ و سێ جار لێدان.. رادەوەستا و پاش تاوێك دەستی پێ دەکردەوە.

لۆکەم ئاخنییە گوێچکەکانم.. دواتریش توند دەستم پێوەگرت؛ بەڵام هەر گوێم لە سەدا و لێدانی ئەڵقە گەورە ئاسنینەکە بوو. هەروەك ئەوەی دەرگاکە لەنێو سەرمدا بێت و لەوێدا دەستە عەیارەکان بە نیقاعێکی هێمن و لەسەرخۆ هەراسانم بکەن.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((تۆ بڵێی تا بەیانی دان بە خۆمدا بگرم و دەرگاکە نەکەمەوە!؟))

بەرچاوم رەشکە و پێشکەی دەکرد و تارماییەکان سەرەتا تلیان لەگەڵ دەکردم. مشکێك کە تا ئەو کاتە لە ژوورەکەمدا نەمبینیبوو؛ لە پەنایەکدا.. کرتە کرت پارچە نانێکی هەڵدەکرِاند.

هێندە نەمابوو کە لە هۆش خۆم بچم.. کاتێ یەکێك پەرۆیەکی تەری بە دەموچاومدا هێنا؛ پاشان کەوتە شێلانی پشتم.. برِبرِەکانم لەژێر پەستانی دەست و پەنجە قەوییەکانیدا کرتە کرتی بوو.

سەرم هەڵبرِی و تێم روانی.. تەواو پەشۆکام؛ کیژێکی رەش پێست و باڵابەرز بوو. پرچەکانی لوول و تێکەڵ.. ددانەکانی سپی.. دەست و پەنجەکانی درێژ و قەوی.. لەشی پر و تۆکمە.. ناو قەد باریك... چەرچەفێکی رەشی لەخۆ ئاڵاندبوو!!؟

پێم گوت:

((تۆ کێی؟))

بە ئاماژەکردنێکی لەوە حاڵی بووم، کە لە دەرگاکەوە هاتۆتە ژوور!... بە پەلە هەستامە سەرپێ و خۆم گەیاندە لای دەرگاکە.. چۆنم جێ هێشتبوو، هەروا بە کلۆم دراوی مابۆوە.

شڵەژام و لەوەدا بوو شتێکی لێ بپرسم!؟

پەشیمان بووەمەوە و خۆم گەیاندە قورنەیەکی ژوورەکە و لەوێوە کەوتە لێ وردبوونەوەی؛ ئەم جۆرە بچم و شێوەیە لە شار و شارۆچکەکانی دەوروداوسێ و بگرە لە وڵاتە هاوسێکانی دەوروبەریشدا بەرچاو نەدەکەوت.. گەردنە درێژ و لووتە پانەکەی تا بلێی سەرنجراکێش و سەیر بوو، دوو ئەڵقە گوارەی گەورەی لەگوێ کردبوو، ملوانکەیەکی لە هێلکە شەیتانۆکە دروستکراوی لە ملدا بوو؛ کە کەڵبە گورگێك لەنێوەڕاستیدا بوو.

زۆر چاوەڕێم کرد، کە شتێك بڵێت و لە جێی خۆی بجوڵێت. پەیکەر ئاسا لەنێوەڕاستی ژوورەکەدا و بەشێوەیەك کە پشتی لە سندووقەکە بوو؛ ڕاوەستابوو.

ئەویش وەك —وەلی سێوە— دەیزانییە لا تەنیشتم... پاش تاوێك ماسولکەکانی دەموچاوی خاو بۆوە.. ساتەوەختێك بە هەردوو دەستی دەموچاوی خۆی گرت و پاشان هەروەك ئەوەی کە ئەو کەسەی پێشوو نەبێت؛ بە جیلوەو ناز و نیگایەکی سیحراوییەوە چاوی بڕییە لاتەنیشتم.

هێندەی نەمابوو دیوە مردووەکەی ناخم زیندوو بکاتەوە؛ هەروەك چۆن سەد ساڵ پاش مردنی دێوی یەکێك لە حەکایەتەکان، بە ئاو پرژێنی دەستی کچۆڵەیەك زیندوو دەبێتەوە...

هێندەی نەمابوو، ساڵانێکی دوور و درێژی ڕەبەنیم بە هەدەر بدات.. بۆ یەکەمجار بوو، پاش ئەو پەیوەندییە کورتخایەنەی کە بە هەرزەکاری لەگەڵ کچۆڵە ڕەشتاڵەکەدا هەمبوو؛ شتێك لە ناوەوە بجوڵێنێت و بهەژێنێت.. شتێکی جیاواز لە خۆف و سڵکردنەوە؛ شتێکی هاوشێوە و لێکچووی یەکەم ماچ و دوا ماچی ژیانم.

پێشتر بەم جۆرە بیرکردنەوە و چەشنە خەیاڵانە زارەترەك و پەریشان دەبووم.. دەلەرزیم و ئیفلیج دەبووم... بەڵام وا ئێستاکە هەستێکی جیاواز لەنێومدا گوزەر دەکات و هێندەی نەمابوو، هەرزەکار ببمەوە و لە کیژە ڕەش پێستەکە بچمە پێش؛ کە شوێنی کەڵبەی دێرینی گەماڵەکەم بیرکەوتەوە!!؟

پاش ساتەوەختێکی کەم لە بێدەنگی و تێرامانم؛ ماجەرای یادەوەرییەکانی عومرێکم هاتە پێش چاو.. پاشان وەك سەدان بەلەمی لە کاغەز دروستکراوی سەر تەنکە ئاوێك، تەربوون.. ئەندێشەکانم کۆلارە ئاسا پەتیان پسا و با بردنی؛ لە لق و پۆپی درەختەکان ئالأن.. پاشان تاوە بارانێك شڕ و پڕی کردن.

لەوەدا بوو کە شتێك بڵێم!؟

چەرچەفە رەشە لە خۆ ئالأوەکەی تا سەر مەمکەکانی داماڵی و هێدی هێدی داماڵین و رووت بوونەوەی گەیاندە سەر ئاوکی رەش داگەڕاو و بە قوولا چووی...

لەو ساتەوەختەدا، هەروەك ئەوەی ئێشی شوێن کەڵبەی گەماڵەکە تازە بووبێتەوە؛ شەپۆلی ئازارێکی بەسوێ لە هەمان شوێن جێگەی کەڵبەکانییەوە، شەپۆلی دەدا. چاوەکانم ئاویان تێزا و رووکاریشم بە تەواوی رەش داگەڕا، نەدەکرا لەوە زیات بێ دەنگ و دەستەوەسان، بەرامبەر بەوەی کە روو دەدات رابوەستم.

هەر بۆیە بە پەلە پرووزێ بەرەو دەرگا کلۆم دراوەکە چووم و کردمەوە.. ئەودەمەی کە پێم گوت ((بچۆرە دەرەوە)).. ئەو رووت و قووت لە جێی خۆیەوە تێی دەڕوانیم!؟

نازانم بۆ لەو ساتەوەختەدا، هێندەم بەدەمدا هات و پێم گوت:

((سندووقەکە نابینیت!؟ هەست بە تارماییەکان ناکەیت!؟ گوێت لە دەنگی مردووەکان نییە!؟...))

پاش ئەوەی بە هەمان شێوە و ئیقاع دێڕەکانم بۆ چەند جارێك دووبارە کردەوە.. کچە سەر و سیمای گۆڕا.. هەڵچوون و داچوونی حەز و ویست و ئیگا ناڵۆشارییەکانی کپ بۆوە و مەیی و پاش تاوێك بە تەواوی رەنگی مردووی لێ نیشت و وەك تاتە بەردێك لەجێی خۆی راوەستا.

بێ چارە و دەستەوەسان، ژوورەکەم جێهێشت و بڕیارمدا کە لە نێوەندی دەرگا کراوەکەدا، دابنیشم و تا بەیانی بڕوانمە دەریاچەکە.. بەڵام هێشتاکە نەگەیشتبوومە نێوەڕاستی دەرگاکە؛ کە خۆم لە دەرەوەی دەرگاکەدا بینییەوە!؟ ئاوڕم دایەوە دەرگاکە لە پشتەوە کلۆم درابوو، لەبەر خۆمەوە گوتم:

((بەڵام چۆن دەبێت؛ هێشتاکە نەگەیشتوومەتە نێوەڕاستی..!؟))

بە مستە کۆڵە بەربوومە دەرگاکە؛ بەوەشەوە نەوەستام زۆربەی دار و بەردی ئەو دەوروبەرەم بە دەرگاکەدا کێشا.. بەڵام هەروەك ئەوەی کە کەسی تێیدا نەبێت؛ وەڵامێك، چرپەیەك، هەست و خوستێك نەبوو.

لەوەدابوو، کە لە درزێکی مابەینی دەرگاکەوە بڕوانمە ژوور؛ مۆمەکان کوژانەوە...

کزە بایەکی سارد دەم و چاوی توێکاری دەکردم...

چاوەکانم سوور هەڵگەڕابوون و کەپووم لووشکە لووشکی پێ کەوتبوو. گوێیەکانم هێندە تەزیبوون؛ کە هەستم نەدەکرد مابێتن.

شڵپ و هووڕی دەریاچەکە، گوێزان ئاسا.. ئەندامەکانی جەستەی ئەو ساتە وەختە بێدەنگییەی توێکاری دەکرد؛ بە چەشنێك کە دەنگ و سەدایەکی ئاوازە و نائاسایی لێ پێك دەهات...

پاش ئاوێك پێڵووەکانم قورس بوون و لەجێی خۆمدا گرمۆڵە بووم...

نازانم ئەوەدەمە خەوتبووم.. یان تەنها چاوەکانم خەواڵوو بوو؛ کاتێك تارمایی -ئەوا-م، لە نزیك خۆمەوە بینی.. گلێنە لە چاوەکانیدا نەمابوو؛ هێندەی هێلکە کۆترێك چاوە دەرپۆقیوەکانی گەورە ببوون.. سپی و ترسناك لە شتێکیان دەڕوانی!؟

هیچی نەگوت و پاش کەمێك دیار نەما...

دواتر تارمایی کەشتییەکی چارۆکەدارم کەوتە بەرچاو.. کە ئاڵایەکی ڕەش لە بەرزترین شوێنیدا دەشەکایەوە؛ وێنەی کەللە سەرێك و دوو پارچە ئێسکی لەسەر کرابوو...

هەروەك ئەوەی لە گەرمەی هێرش کردن و پەلاماردان و شەڕە جەنگێکی دەریاییدا بن.. دەنگی ڕینگەی شمشێر و تفەنگ و جار جارە تۆپەکانیشیان؛ دەهاتە گوێم.. بەڵام ئەو کەشتییەی کە لەگەڵی دەجەنگان، نەکەوتە بەرچاوم و نەمبینی.

هێندەی ئەبرد کەشتییەکە، لە چڕە دووکەڵ و تەمتورمانێکی خەستدا ون بوو...
سپێدە دەرگاکە بۆ خۆی ترازا و بە ئاگا هاتم.. چوومە ژوور و بە خێرایی چاوم گێڕا.. نە کچەکەی لێبوو، نە سندووقەکە؛ نە کەلوپەکانی تریش.. هەروەك ئەوەی نەچووبێتمە نێو ژوورەکەی خۆم و چووبێتمە نێو ژوورێکی تری شوێنێکی تر!!؟
تیشکێکی بە تین چاوەکانی دەچووزاندەوە و رەنگەکانی لەبەرچاومدا تێکەڵ دەکرد...
لە شوێنێکی ژوورەکەدا.. یان با بڵێین لە شوێنێکی ئەودیو دەرگاکەدا، بە چیچکانەوە دانیشتم و پاشان کەوتمە پەل هاویشتن و گەڕان بە شوێن ئەو شتانەی کە پێشتر لە ژوورەکەمدا هەبوون و لە ئێستادا ون و نادیار بوون!!؟
پانتاییەکانی پەل هاویشتن و گەڕانم، سنووری ئەو ژوورەی تێپەڕکرد؛ کە پێشتر تێیدا ژیابووم... قوڕنەکانیم بۆ نەدۆزرایەوە و شتێکم لە ژوورەکەدا نەبینییەوە کە دەستی پێوە بگرم!؟.. دیوارەکانیم بیرکەوتەوە!!؟...
دەبوو یەکێك لە دیوارەکان بدۆزمەوە؛ تا دەستی پێوە بگرم و لەوێوە بگەمە ژێر تاقە هەڵواسراوەکە.. پەیژەکە بدۆزمەوە و پێیدا هەڵگەڕێم؛ هێندەی قەبارەی سندووقەکە پەل بهاوم.. لەمانەوە و بوونی ئەبەدییانەی دڵنیابم!؟
بەڵام پێنەدەچوو دیوارێك لە ژوورەکەمدا مابێت؛ یان راستترە بڵێم پێ نەدەچوو ژوورێك هەبێت! بە هیچ نەدەگەیشتمە سەر هیچ و هەروەك ئەوەی لە دەشتێکی کاکی بە کاکیدا ون بووبێتم.. عەوداڵ و سەرگەردان ملم دەنا.
بەڵام نەدەکرا و بە لامەوە ماقوڵ نەبوو!!؟
چونکە من بۆ خۆم لەوە دڵنیابووم.. کە پێش تاوێك، لە دەرگایەکەوە هاتمە ژوور؛ کە دەرگای ژوورێك بوو.. ژوورەکەش سندووقێکی تێیدا بوو!!؟
پاش ئەوەی بێهودە بووم، لە دۆزینەوەی دیوارەکان... کەوتمە هەوڵی دۆزینەوەی ئەو دەرگایەی؛ کە کەمێك لەمەوپێش بە نێوەڕاستیدا تێپەڕبووم و لەوێوە هاتمە ژوور.



# کۆتایی

نازانم بۆ کە لە خوێندنەوەی دەستنووسەکە بوومەوە؛ هەروەك ئەوەی لە یەخچاڵێکیان نابێتم، هەموو گیانم هەڵدەلەرزی.. دەتگوت بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێکی بەستەڵەکاویدا جێ ماوم.. پێیەکانم بە تەواوی هەڵئاوساو و سڕبوون.. ئێشێك لە شەویلگە و ددانەکانمەوە دەهات و لێوەکانم شەقار شەقار و هێشك ببوون.

سەرماکە پشتمی چەماند بوو و بڕبڕەشمی وەژان هێنابوو.. دەستەکانم گوێیان نەدەکرد...

هەروەك ئەوەی لەنێو هەمان واگۆنە گەرم و گوڕەکەی پێشرودا نەبم و بەدەم خوێندنەوەوە هەڵسابێتم و چووبێتمە نێو واگۆنێکی دیکەی سارد و سڕەوە.

ئەوەی بە لاشمەوە سەیر بوو، میترۆکە لە جێی خۆی نەدەجولا و پێم وابوو، کە رەنگە دەمێك بێت لە هەمان شوێندا راوەستابێت.

کە چاوەکانم هەڵهێنا.. هەموو شتێك بەرەشی هاتە بەرچاوم... پاش کەمێك لە مل وەرچەرخان بەراست و چەپی خۆمدا؛ دەستم بۆ ئەو چاویلکەیە برد کە لە چاومدا بوو.. بە تەواوی لە چاویلکەی ئەو ئاسنگەرانە دەچوو، کە لە کاتی لەحیم کردندا لە چاویان دەکرد.

سارد و سڕی ئەو شوێنەی کە تێیدا بووم؛ وەك سارد و سڕی ئەمڕۆی شاری — مۆنوا— وابوو.. پێم وابوو کە رەنگە زۆر لەو رۆژە ساردتر بێت، کە ئەنکمی تێیدا رەق بۆوە و مرد.

ئەو دەمە منداڵ بووم و لە ئێوارە وەختێکی زستانێکی سارد و سڕدا.. لە پەنجەرە تەڵخەکانی ئەو ژوورەی کە دەیڕوانییە سەر حەوشە گەورە لاکێشەییەکەمان؛

دەمرواتییە ئەو تاتە شۆڕەی کە لە بەیانییەوە دوو زرتە زەلام هێنابوویان و لەنێوەڕاستی حەوشەکەدا جێیان هێشتبوو.

سەرەتا ژنێك پەیتا پەیتا بەفرەکەی سەری رادەماڵی.. دوایی هەروەك ئەوەی کە بێزار بوو بێت، وازی لێ هێنا و تا ئێواری هێندەی ئەژنۆیەك بەفری لەسەر کەڵەکە بوو.

یەك دوو کەس لە حەوشەکەدا، لمبارەی ئەنکمەوە دەدوان و ئەمدەزانی باسی ئەوە دەکەن، کە هێشتاکە گیانی ئەداوە و رەنگە زۆر بخایەنێت.. یان مشتومڕی ئەوەیان بوو، کە چۆن چۆنی کفن و دفن و شتنەکەی جێبەجێ بکەن و بە چ رێگەیەکدا بیگەیەننە تاکە سەرقەبرانێکی دووری قەراغ شارۆچکەکە.

بۆ حەوتوویەك دەچوو، بێ وچان بەفر دەباری و گشت رێگە و بانەکانی گرتبوو.. وەك کفنێکی سپی دار و بەردی داپۆشیبوو.. بەفرەکە بۆنی گیانەڵا و مەرگی لێ دەهات.

باهۆز و بەفر تەلی کارەبای هەموو شارۆچکەکەیان پساندبوو... کابرایەکی کەڵەگەت، کە لە حەوشەکەدا لەگەڵ باوکمدا راوەستا بوو.. پەیتا پەیتا لایتە گەورەکەی دەستی دادەگیرساند و ئاماژەی بۆ بەرزی ئاستی بەفرەکە دەکرد و جار جارەش لایتەکەی بەرز دەکردەوە و کلووە بەفرە گەورەکانی پیشانی باوکم دەدا؛ کە چۆن گێژ دەخۆن و خۆیان دەدەنە دەست ئەو باتووندەی کە بە نارەزووی خۆی لوولی دەکردن و چ کون و کەلەبەر و پەنا و پاسارێکی مەبەست بوایە لەوێی دەناخنین.

بە تەنیا لە ژوورێیان نابووم و دەرگا ئاسنە ژەنگاوییەکەیان لەسەر کلۆم دابووم؛ ئەو ژوورەی کە تێیدا بووم، تەنها بۆ هەڵگرتنی دانەوێڵە و شەکر و چا و رۆن و شتی زیادە بەکار دەهات، دیوارەکەی پێنج شەش کەوڵە رێوی و دوو سێ کەوڵە دەڵەکی پێوە هەڵواسراوە؛ کە باوکم بۆ خۆی راوی کردبوون.

چرایەکی کزیان لەسەر تەپڵەکێکی نێوەڕاستی ژوورەکە بۆ دانابووم، مافوورێکی ئەستووریان لەسەر عەردی ژوورەکە راخستبوو.

هێندەی وەبیرم دەهاتەوە، لەو ئێوارە وەختەدا کلیتە رەشەکەی باوکم لەسەر کردبوو.. پالتۆ سەربازییەکەی باپیریشم، لەخۆ پێچابوو؛ کە هەردەم لەو ژوورەدا بە بزمارێکی گەورەی ژەنگاویدا، هەڵواسرابوو.. کۆمەڵێ نیشانە و نارمی زۆر عەجایبی پێوە بوو.. قۆپچەکانی هێندە گەورە بوون؛ کە بە منداڵی دەبوو پەنجەکانی بۆ بکشێنم.. تا ئەم سەرو ئەو سەری بگرم و گەمەی پێ بکەم.. بە پەت و بەنێکی وا بە پالتۆکەوە کرابوو.. لێ بوونەوەی مەحاڵ و ئەستەم بوو.

ئەنکم هەردەم بەسەرهاتی کوژرانی باپیرمی بە یەك چەشن بۆ دەگێڕامەوە و دەیگوت: ((باوکم هێشتاکە منداڵ بوو؛ کە باپیرت رەوانەی بەرەکانی جەنگ کرا و دوو ساڵی رەبەق چاوەڕێمان کرد و پاشان هەواڵی کوژرانیمان، پێ گەیشت.. لە دوای خۆشی تەنها پالتۆ سەربازییەکەی بۆ جێهێشتین)).

پەیوەندییەکی سەیر، من و ئەنکمی پێکەوە گرێ دەدا... هەردەم ئەو حەکایەتە سەیر و سەمەرانەی بۆ دەگێڕامەوە، کە لەبن نەدەهاتن. هەموو شەوێك بە چەشن و شێوازێکی جودا، لە حەکایەتەکانی پێشتر.. حەکایەتێکی دی بۆ گێڕامەوە. راپێچی دنیای جنۆکە و دێو و درنج و شتە سەیرەکانی دەکردم.. هیچ کات کۆتایی حەکایەتەکانیم نەدەبیست و پێش وەخت دەخەوتم.

دەمویست نەمرێت و بژێتەوە!؟ وەکو جاران لە ئامێزم بگرێت و تیر تیر ماچم بکات.. نەدەکرا شەوێك، بەبێ گوێگرتن لە حەکایەتەکانی ئەو بخەوم!!؟

نەمدەزانی لە چ ژوورێکدایە و کێ بە دیارییەوە دەگری!؟... گوێم لە دەنگی گریانی هیچ کەسێك نەبوو.. هەروەك ئەوەی هیچ نەبووبێت؛ زۆر بە ئاسایی دەدوان و گفتوگۆیان دەکرد.. گرفتێك کە مشتومڕیان لەسەر دەکرد، چڕ و پڕی بەفرەکە بوو؛ ئەو بەفرەی کە ببووە لەمپەری جێبەجێکردنی کفن و دفن و زوو ناشتنی ئەنکم.. ئەو لە شوێنێکی ماڵەکەدا راکشابوو، رەنگە ئاگای لەو هەموو مشت و مڕە بووبێت و نەفرەتی لە هەموان کردبێت.

بەڵام من دەمویست، دەرگاکەم لێ بکەنەوە و بچمە ئەو شوێنەی کە نەنکمی لێ ڕاکشاوە... ئەو کە دوا حەکایەتی بۆ گێڕامەوە، پێی نەگوتم کە دەمرێت و بۆ هەتا هەتایە جێم دەهێڵێت.

دەبوو ئاگادارم بکات!؟ تا بۆ دواجار گوێ لە کۆتایی حەکایەتێکی ئەو دوا شەوەی بگرم و تێر تێر ماچی بکەم؛ دەبوو بۆنی مێخەکبەندەکەی لاگەردنیم کردبا.. دەبوو لە هەڵسووڕانی دەنگە قەزوانەکانی تەزبیحەکەی ڕابمابایە!!؟

ئێوارەیەکی کپ و سامناک بوو؛ کە جار جارە، سەرباری مشتومڕی باوکم و کەسانێک.. کە پەیتا پەیتا لە دەرگای حەوشەکەمانەوە دەهاتنە ژوور و دەچوونەدەر؛ هەروەک ئەوەی چاوەڕێی هاتنی کەسێک یان شتێک بن!؟

نەمدەزانی بۆ هەر کاتێک، بیرم لە مەرگی نەنکم و ئەو ڕۆژە هەرە ساردەی سەردەمی منداڵیم کردبا.. هەر ئەوەندەم وەیاد دەهاتەوە.. یان ڕەنگە بۆ خۆم نەمویستبێت، کە لەوە زیاترم بیرکەوێتەوە!؟

ئەمڕۆی شاری —مۆنوا—، ڕۆژێکی ئاوا سارد و سڕ و سامناک بوو. لە زۆر ڕووەوە لەو ڕۆژە هەرە ساردەی منداڵیم دەچوو...

هێندە هەبوو، کە لێرە تا ئەو کاتەش کە بە پێپلیکانە دوور و درێژەکەدا چوومە خوارێ...

هێشتاکە کلووە بەفرێکیش چییە نەکەوتبوو!!؟



ڕەشی هاوێنەکانی چاویلکەکەی چاوم، چاوەکانی دەنیشاندم و نەمدەزانی بۆچی لە چاویان کردووم!؟ هەرچەند هەوڵم دەدا.. هەروەک ئەوەی بەسەرمەوە نووسێنرابێت؛ بۆم لانەدەبراو تا دەستیشم بۆ دەبرد.. زیاتر چەسپ و جێگیر دەبوو.. بەشێوەیەک کە هێندەی نەمابوو مێشکە سەرم بتەقێنێت. چاوەکانم دڵۆپە ئاویان پێدا دەهاتە خوارێ و لە ڕوومەتمەوە بەرەو خوار ڕێچکەیان دەبەست.

هێندە ناڕەحەت و قەڵس ببووم؛ کە وەك کوێرێك بە چوار دەوری خۆمدا دەستم دەهاوێشت و دەمویست شتێکی وام چنگ کەوێت؛ کە بتوانم هاوێنە ڕەشەکانی چاویلکەکەی پێ بشکێنم، لە ژیانمدا هیچ جۆرە چاویلکەیەکم لە چاو نەکردبوو؛ جا چ جای چاویلکەیەکی ئاوا هاوێنە ڕەشی قەترانی.

هێندەی خۆم نائومێد و بێهوودە بووم، دە هێندەی تریش چاویلکەکە ناڕەحەت و بێزار و دڕدۆنگی کردبووم.. وەك مێوەیەکی کرمەڕێز، لە ناوەوە کرمە وردەکانی دڵەڕاوکێ و دوودڵی، پەرێشانی و شپرزەییان لە رووکارمدا وەدەردەخست. نەمدەزانی ئەوەی کە دووچاری ببووم، تەنها خەونێکی سامناك بوو یان ڕاستییەکی ئەو ساتە وەختە بوو کە تێیدا بووم.

نێلە نێل، هەروەك ئەوەی کلۆی ئاگرێك لە نێومدا داگیرسابێت؛ گێنگڵ و ماخۆلانم بوو. دەمویست لە کورسییەکە جیا ببمەوە و هەستمە سەر پێ.. بەڵام نەدەکرا و بە هیچ لێی جیا نەدەبوومەوە!؟

وام هەست دەکرد، کە هەموو شتێکی ناوەوە و دەرەوەی خۆم، بەسریش پێمەوە نووسێنرابێت.. قامکەکانم بە چەشنێك پێکەوە نووسابوون، کە بە ئەستەم بۆم دەبزوان، گەرچی چەند جارێك ویستم قۆپچەی کراسەکەم بکەمەوە؛ بەڵام لەوە دەچوو بێهوودە خۆم خەریك کردبێت.

ویستم پڕ بەدەم هاوار بکەم.. بەڵام لێوەکانم بە چەشنێك چووبوونە سەر یەك و پێکەوە نووسابوون؛ کە هەر دەتگوت بە دەرزی و دەزوو پێکەوە دادووریبوون.

هەروەك ئەوەی لە نێو مەنجەڵی بنێشتی تواوەیان نابێتم.. ماسولکەکانم شەکەت و ماندوو بوون و جووڵەیان بۆ نەدەکرا.. گوشارێکی زۆر لە ناوەوە ئێسکەکانیان تێك شکاند!؟

نەمدەزانی هانا بۆ کێ بەرم!؟

پێم وابوو، بە هەموویان تێم بڕوانن و بزەیان بێت. خۆم بەو مێشوولەیە دەهاتە بەرچاو، کە لە داوی جاڵجاڵۆکەوە دەناڵێت.. کە تا بجووڵێت و هەوڵی ڕزگاربوون بدات؛ زیاتر داوەکە لەخۆی دەئاڵێنێت.

تا دەهات چاویلکەکانی چاوم قورس تر دەبوون؛ بە چەشنێك کە سەرمی خستبووە لۆژە لۆژ و پێ نەدەچوو، کە ماوەیەکی زۆر بەو چەشنە بۆم رابگیرێت.

گەر کرابا و وازیان لێ هێنابام؛ لەسەر عەمردەکە لێی رادەکشام!؟ گوێم لە دەنگی هێنان و بردنی چەند شتێك بوو.. پاشان گوێم لە دەنگی چرپە چرپی کەسێك بوو؛ کە نەدەکرا هیچی لێ حاڵی ببم.

بۆنی بۆن عەتری کەسێك؛ کە پێ دەچوو لە دووردوە راوەستابێت، لە هەردوو کونە لووتمەوە بەرەو سەر هەڵکشا.

هێدی هێدی لێم هاتە پێش.. بە رۆیشتن و دەنگی پێڵاوەکەیدا، بە مێینە دەچوو. چەند جارێك لۆکەیەکی تەڕی بە دەمارێکی لاڕاستی ملمدا هێنا و پاشان دەرزییەکی تیژ و درێژی تێ رۆکرد.

بۆ تاوێك ئێش و ئازارێکی سەیر سڕی کردم و پاش تاوێك پەنجەکانم جووڵەیان تێکەوت و بزۆزی کەوتە ماسولکەکانم. لە جاران باشتر هەناسەم بۆ دەدرا و هەستم بە نەمانی ئەو ماددەیە دەکرد، کە پەنجەکانی پێکەوە نووساندبووم.

کەمێك لەسەر کورسییەکە بەرزبوومەوە و هێندەی نەمابوو هەستمە سەرپێ؛ دەستێك لە جێی خۆمی دانیشاندمەوە.

هەر چۆنێك بێت لە جاران باشتر بووم و ئاهێکم پێدا هاتەوە.. ئەو گوشارەی کە پێشتر لەسەر ئێسکەکانم هەبوو؛ هێدی هێدی دەڕەوییەوە و نەدەما.

هەموو ئەو شتانەی کە پێ دەچوو، بەسەریش پێمەوە نووسێنرا بێتن؛ هێور هێور لێم دەبوونەوە.

قۆپچەکانی کراسەکەم ترازاند و شتێك دەستمی بۆ مووەکانی سنگم برد.. پێ دەچوو کە سەرتاپای جەستەم، کەرووییەکی رەنگ بۆری مەیلەو سەوزی هەڵهێنابێت و لێنجاوێکیش لەبن هەنگڵمەوە دابچۆڕێتە خوار.

نەدەکرا داوایان لێبکەم، کە لێم بگەڕێن؛ تا بە کەیفی خۆم بچمە گەرماوێکی گەرمەوە و چینێك چڵك و پیسی لە خۆم دابماڵم.

بیرم لە هەڵم و هاڵاو و ناوی گەرمی تاکە گەرماوێکی ئەو شارۆچکەیە دەکردەوە؛ کە لێوی هاتبووم و پێنج شەش جارێکیش خۆم تێیدا شوورشتبوو...

خاوەنەکەی کابرایەکی کەڕ و لاڵ و داماو بوو؛ زۆر حەزی بە پەروەردەکردنی باڵندەی دەنگ خۆش و رەنگاورەنگ دەکرد... نازانم چۆن بەبێ ئەوەی گوێی لێ بێت؛ دەیزانی دەنگی کامە بولبوول لەوەی تر خۆشترە. مەست دەبوو بە جریوە و خوێندنیان و هەروەك ئەوەی لەگەڵیان بلێتەوە؛ لێوەکانی دەبزواند و لەو کاتانەدا چاوەکانی حەز و خۆشیان لێ دەباری.

هەر کە دەچوویتە نێو گەرماوەکەوە.. لە بەشی دەرەوەیدا، قەفەزی جۆراوجۆرت دەکەوتە بەرچاو.. چیت ویستبا لە باڵندە و تەیر و توی عەجایب، لای ئەو دەست دەکەوت.

هێندەی خەریکی فرۆشتن و کڕینی باڵندە بوو؛ هێندە ئاگای لە گەرماوەکەی نەبوو.. ئاترێکی لچ ئەستووری کردە باڵا، گەرماوەکەی بۆ بەڕێوەدەبرد و چۆنی ویستبا، وایکرد.

چەند حەزم دەکرد، لەم کاتەدا لەنێو ئەو گەرماوەدا بوومایە و بە کەیفی خۆم، خۆم شوشتبا.. کە رووی قەتماغە بەستووی سەر پێستم، بە لیفکەیەکی زبر راماڵیبا و لینجاوی داچۆڕاوی بن هەنگڵم چۆڕە بڕ کردبا...

پاشان جلێکی نفت و نوێم لەبەر کردبا!!؟



هاوێنە رەشەکانی چاویلکەکەی چاوم، بۆ تاوێك رۆشنایییەکی کەوتە سەر و دواتر هێندە روناك بۆوە؛ کە هێندەی نەمابوو، کوێر ببم!؟

پاشان هێدی هێدی رووناکییەکە خەفە بۆوە و رەنگێکی پەمەیی لەسەر هەردوو هاوێنەکە جێ ما.. رەنگێك؛ کە لەو گوڵانە دەچوو کە سەردەمێك هەوڵی وێنەکێشانیم دابوو.. رەنگێك؛ کە لە کراسی بەری تاکە کچۆڵەیەك دەچوو، کە سەردەمانێك خۆشم ویستبوو!!؟

دواتر چەند خاڵێکی سپی کەوتە سەر رووی هەردوو هاوێنەکە و پاشان وەك باڵی پەپولەیەکی لێ هات و هێدی هێدی کەوتە جووڵە. یەکەمجار لەسەر گوڵێکی زەرد نیشتەوە و دواتریش چووە سەر گوڵێکی سوور.

هەروەك ئەوەی کە بڕوانە سکرینێك؛ هێدی هێدی رەنگ و وێنە و دیمەنەکان روونتر بوونەوە.

سەرەتا کچە جحێڵێکی چاو گەورە و باڵا بەرز.. کەمەر بارێك.. لێو پڕ ئاڵ.. چەناگە کوتراو.. خوێن گەرم و ئاودارم کەوتە بەرچاو؛ پاشان حەکایەتخوانێکی ریش سپی، پێ بە پێی گۆڕانی وێنە و دیمەنەکان.. لەبەر خۆیەوە؛ کەوتە گێڕانەوەی بەسەر هاتێك:

(لە رۆژ و زەمان و عەیامێکی زۆر لەمەو پێشدا و بە رێکەوت کچە قەرەجێکی ئاڵا و واڵا؛ بۆ ماوەیەك لە هاوڕەگەزەکانی خۆی دوور دەکەوێتەوە و لەسەر ئەو رێگەیەی کە دەچێتەوە سەر ئەو شارەی کە سوڵتانێکی تێیدا دەژیا...

بە تەنیا دەستی ریبوارێك دەخوێنێتەوە!!؟

وەك هەموو رۆژێك، سوڵتان لەو کاتەدا.. خۆی و وەزیری دەستە راستی و ژمارەیەك لە دەست و پێوەند و برێك لە سەربازە تایبەتییەکانی بەوێدا تێپەڕ دەبن.. سوڵتان کچە دەبینێ و بە جوانییەکەی سەرسام دەبێت.

لە وەزیری دەستە راستی خۆی دەپرسێت و دەڵێت:

((ئەو کچە کێیە؟))

وەزیری دەستە راستی لە وەڵامدا دەڵێت:

((قوربان ئەو کچە قەرەجە و ساڵی جارێك، گەڵ هۆزەکەی دێنە مەملەکەتەکەی جەنابتان و هەر ماوەی لە شوێنێك دەوار هەڵدەدەن. پیاوەکانیان لەژێر دەوارەکانیاندا، بێژنگ و هێڵەك و چەقۆ دروست دەکەن و ژنەکانیان بە سوالکردنەوە خەریك دەبن و کچە جحێڵەکانیشیان وەك دەبینیت بە دەست خوێندنەوە و فاڵ و جادووگەرییەوە سەرقاڵ دەبن.))

سوڵتان وەك هەرزەكارێك خرۆشێكی سەیر لە ناوەوە پشێوی دەكات و سیحر و جوانی كچە رایدەكێشێت؛ بۆ تاوێك هەروەك چۆن ڕاوچییەك دەڕوانێتە نێچیرەكەی، ئاوا لە كچەكە رادەمێنێت.

پاشان سەری بەرزدەكاتەوە و بە تیلەی چاو سەیرێكی بەرپرسی سەربازە تایبەتییەكانی خۆی دەكات، بە دوو قامكی دەستە راستی كچەكەی پیشاندا.

بەرپرسەكە لە داواكاری و تەڵەبی سوڵتان تێدەگات و دەرحاڵ كچەی بە پەلكێشكراوی دەهێنێتە بەردەمی.

سوڵتان دەمی بەش دەكات و لەژێر سمێڵە چڕ و پڕەكانیەوە ددانە كلۆر و ڕەش داگەڕاوەكانی وەدەردەكەوێت...

لە سەرەخۆ و بە دەنگێكی نەرم و نیان.. بە كچە دەڵێت:

((دەمەوێت دەستم بۆ بخوێنیتەوە؛ بەڵام لێرەدا نا.. پێكەوە دەچینە كۆشكەكەی خۆم.

كچەكە بە شپرزەییەوە، بە سوڵتان دەڵێت:

((بەڵام قوربان، من تەنها دەتوانم لێرەدا دەستت بۆ بخوێنمەوە.. ئێمەی قەرەج پێكەوە دەژین و پێكەوە دەچینە مەملەكەتان و پێكیشەوە ون دەبین.. لە هیچ جێگەیەكدا بەنگ نابین.. وەك باڵندە كۆچەرییەكان ئۆقرە ناگرین..))

گەرچی سوڵتان بە قسەكانی نارەحەت دەبێت.. بەڵام بەسەر خۆیدا ناهێنێت و بە شێوازێكی شیرین و دەنگێكی كەمێك لەرزۆك.. زاری هەڵدێنێتەوە و دەڵێت:

((چیت پێ خۆش بێت، بۆت دەكەم.. زێڕ و زیو و خشڵ و گەوهەری نایابت دەدەمێ.. هەنگوینی جۆراوجۆر و شەربەتی میوە و گوڵە كێویلە و ئەودی حەزت لێ بێت؛ رۆژانە لەسەر خوانی ناخواردنت ئامادە دەبێ. دەنێرم جلی ئاڵا و واڵای ئاوریشمت، لە بنی دنیاوە بۆ بهێنن...))

ئەم بەند و باڵۆرەیەی سوڵتان، كچە دەگەیەنێتە سەر لێواری شێتی و هاربوون... پڕ بەدەم و لە ناكاو هاوار دەكات.

بەرپرسی پاسەوانە تایبەتییەکانی سوڵتان؛ بە دەستە تووکاوییەکانی زاری کچە دەگرێت...

سوڵتان بۆ هێورکردنەوەی کچە بێ سێ و دوو دەمی هەڵدێنێتەوە و دەڵێت:

((مەترسە خۆ من هیچت لێ ناکەم؛ تەنها نەوەندەم لە تۆ دەوێت.. کە رۆژانە دەستم بۆ بخوێنیتەوە و لە رووداوەکانی داهاتوو ئاگادارم بکەیت.))

کچە لە حەژمەتا پەلاماری بەرپرسی سەربازە تایبەتییەکانی سوڵتان دەدات و بە چنگ دەموچاوی دەرنێ.. دواتر شەقێك لەناو گەڵی هەڵدەدات و هەڵدێ.. زۆر بە خێرایی و لە چاوترووکانێکدا هێندە لەگەڵ گورگەکەی چوار دەوری سوڵتان دوور دەکەوێتەوە؛ کە عاجبانیان لێ دێ. پاش هانکە هانك و شەکەتی و ماندووبوونێکی زۆر؛ دەست و پێوەندەکانی سوڵتان بەهەر حاڵێك بێت، دەستگیری دەکەن...

بێ گوێ دانە داد و فیغانی؛ کچە پەلکێش دەکەن و بە پەلە دەیگەیەننە کۆشکی سوڵتان.

سوڵتان پاش ئەوان دەگاتە کۆشکەکەی و بە پەلە پرۆزێ کارەکەر و کەنیزەك و ژنەکانی بانگ دەکات و بە تەوسەوە پێیان دەڵێت:

((خۆ دەزانن، چی دەکەن!!؟))

کارەکەر و کەنیزە و ژنەکانی سوڵتان، دەرحاڵ کچە دەبەنە گەرماوێکی لە شووشە دروستکراوی نێو کۆشکەکە و تا ئێواری پێوەی خەریك دەبن.

هاوار و پەلکوتان و گریان و پەلاماردان و چنگە کرێنی کچە بێ سوود دەبێت؛ دەرۆستی ئەو هەموو ژن و کەنیزەك و کارەکەرانەی سوڵتان نایێت. بە هەموویان لە حەوزێکی تایبەتی دەنێن و یەکێکیان بە لیفکەیەکی زبر تێی دەکەوێت.. هێندە لە جەستەی کچەی هەڵدەخشێنێت بە تەواوی توێکێکی پێستی دەبات و دواتر یەکێك لە کەنیزەکەکان بە شانەیەکی لە تەختە دروستکراو پرچە لوولەکانی خاو دەکاتەوە.

بە پێوە رایدەوەستێنن و بە یەك دوانێك خەریکی هەڵگرتنی مووەکانی لەشی دەبن و زۆر شوێنیشی بە مووس دەتاشن...

کچە بە هیچ داناسەکنیّ و هێندە دەجوولێت، زۆر شوێنی جەستەی بە مووسەکە زامدار دەبێت. خوێن و کەف و سابوونی سەر جەستەی کچە، لەژێر سێلاوی ناو پێداکردنی پەیتا پەیتای سەرە ژنێکدا، تا دێت ناوی پەنگ خواردووی نێو حەوزدکە، زیاتر خوێناوی و کەفاویتر دەکات.

هەر چۆنێك بێت، چاوەڕێ دەکەن.. تا ئەو دەمەی شوێنە زامدارەکانی برێك سارێژ دەبن و خوێنە لێچۆڕاوەکانی دەگیرسێتەوە.

خاولییەکی سپی تێ دەئالێنن و وشکی دەکەنەوە و پاشان تا پێیان بکرێت گوڵاو پرژێنی دەکەن. دواتر دەیان جۆر مەرهەمی لە گوڵ و گوڵزار دروستکراو لە لەشی دەسوون و عەتر و بۆن لەبن هەنگڵی و پرچەکانی دەدەن.

دواجاریش پاش بگرە و بەردەیەکی زۆر، تاس و لووس لە تارایەکی سووری دەپێچن و پاشان دەیبەنە ژوورە تایبەتییەکەی سوڵتان. بەرپرسی سەربازە تایبەتییەکانی سوڵتان بانگ دەکەن؛ تا بە کلیلەکەی گیرفانی دەرگاکەی لەسەر کلۆم بدات...)

پاش ئەوەی حەکایەتخوانەکە ئەرمەکۆکەیەکی بۆ کرد، درێژەی دایە گوتی:

(شەو درەنگان، سوڵتان پاش خواردنەوە و سەرخۆش بوون؛ بە قامچییەکەوە بۆی دەچێتە ژوور و دەنگی تەقە تەقی پاژنەی پێلاوەکانی سوڵتان؛ کچەی بێدار و شەکەت، زارە ترەك و بێزار دەکات.. بە پەلە پڕ دەداتە پەتۆ سەوزدکەی سەر سیسەمەکە و لەخۆی دەپێچی. پاشان هەر دە دوانزە مۆمە داگیرساوەکەی نێو ژوورەکە دەکوژێنێتەوە و لە پەنایەکدا خۆی مەڵاس دەدات.

سوڵتان دەرگاکە دەکاتەوە و سەری لە تاریکیی نێو ژوورەکە سوڕ دەمێنێ. کەمێك رادەمێنێ و پاشان گەوهەرێکی فۆسفۆڕی دەگمەن و دانسقە لە گیرفانی دەردەهێنێت؛ گەرچی هێندەی هەڵماتێك دەبێت.. بەڵام دەهێندەی مۆمێك تیشك و رۆشنایی دەبێت و لەسەر مێزێکی لاتەنیشتی دەرگاکە دایدەنێت و هەنگاو هەنگاو دەچێتە ژوور.

کچە ناهێڵێت سوڵتان لە ئامێزی بنێت، خۆی رادەپسکێنێ و بە پەلە پرۆزێ خۆی لەژێر سیسەمەکە دەنێت. پاشان وەك مشكێك خۆی لە بنە هێلدارە ئاسنینەکەی گیر دەکات.

سوڵتان بە خنە خن و کۆمەڵێك ورگەوە.. زۆری پێ دەچێت؛ تا خۆی لەژێر سیسەمەکە دەنێ.. کچەی لەدەست دەردەچێ و هەڵدێ.. تاقمێرێك لەژێر سیسەمەکەدا وەگیر دەبێت، پاشان بە چەشنی مشك و پشیلە، راو راوێن و راکە راکەیان تا بەیانی دەخایانێت.. کچە چەند جارێك دەموچاوی سوڵتان دەرنێ.. گاز لە پرز و پەنجەکانی دەستی دەگرێت.. سێ شەو بەم چەشنە دەبەنە سەر، لێدان و برسی کردن و هەڕەشە.. کچە ناهێنێتە سەربار؛ تەنانەت زیاتر شێتگیر و و هارتری دەکات).

حەکایەتخوانەکە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و لە جێی قسەکردن و گێڕانەوە.. دەستی بۆ نمایشێکی سەر تەختەی شانۆیەك راکێشا، کە چەند کەسێك رۆڵیان تێیدا دەبینی.

{کەسێکی ورگ زلێ رۆڵی سوڵتانی دەبینی، گەرچی بە تەواوی لە سوڵتان نەدەچوو، بەڵام وەك ئەو هەڵسوکەوتی دەکرد و دەجوولایەوە.. بەکاوەخۆ، لە بەرپرسی سەربازە تایبەتییەکانی خۆی هاتە پێش و شتێکی بە گوێدا چرپاند؛ پاشان بەرپرسەکە پێنج شەش سەربازی وەدووی خۆی خست و دەرگای ژوورەکەی سوڵتانی کردەوە و لەگەڵ سەربازەکانیدا چوونە ژوور.

-لە دیمەنێکی تردا-

کچە شاڵاو بۆ سەربازەکان دەبا و دەست و قاچیان دەگەزێت.. پاشان هەروەك ئەوەی بە نینۆکەکانی چاوی راستی بەرپرسی سەربازەکان کوێر بکات.. بەرپرسەکە دەست بە چاوییەوە دەگرێت.. بەڵام لە کۆتایی دیمەنەکەدا، دەست و قاچی کچەکە بە سیسەمەکەوە دەبەستنەوە

سولتان سەعاتێکی کۆنی لێ، هەڵدەگرێتەوە و پاشان هەڵدەستێتە سەر پێ و بە کلیلێك دەرگای ئەو ژوورە دەکاتەوە کە کچەکەی تێیدایە.

دەچێتە ژوور و پاش کەمێك چاوگێڕان بە ژوورەکەدا.. وەك شێت بەرەو باڵقۆنەکە رادەکات. پاشان دێتە ژوور و یەکسەر سەیری ژێر سیسەمەکە دەکات. دواتر ناو دۆڵاب و گشت سووچ و قوژبنێکی نێو ژوورەکە دەگەڕێت. پاشان لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

((مەحاڵە... سەعاتێك لەمەوپێش، سەربازەکان توند بە سیسەمەکەوە شەتەکیاندا)).....}.

حەکایەتخوانەکە تارێك تێیڕوانیم و پاشان درێژەی دایە و گوتی:

(سەرسامییەکی بێ وێنە نابلووقەی لێ خوردبوونەوە و تێڕامانی سولتان دەدات. چەند بیر لێ دەکاتەوە، چۆنێتی دیار نەمان و ونبوونی کچەی بۆ یەکالا ناکرێتەوە.

لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

((ئەگەر بەڕاستی سەربازەکان؛ بەو گوریسەی کە من دامنێ.. کچەکەیان توند بە سیسەمەکەوە شەتەك دابێت. مەحاڵە پاش سەعاتێك خۆی و گوریسەکە دیار نەمێنێت. تۆ بڵێی سیحرێکی وای لە سەربازەکانم کردبێت؛ کە نەیانبەستبێتەوە و پێیان وابووبێت کە بەستوویانەتەوە.))

سولتان لەوەدا دەبێت، کە پاشە و پاش بگەڕێتەوە دواوە و بەرپرسی سەربازە تایبەتییەکانی گاز بکات، کە لە ناکاو لە پشتەوە خەنجەرێك دەچەقێنرێتە گازەڕای پشتی.. هێشتاکە بە پێوە دەبێت.. کە یەکێك خەنجەرەکە لە پشتی دەردەهێنێتەوە و دەیداتە دەستی.

سولتان خەنجەرەکە دەناسێتەوە و بۆ دواجار کۆمەڵێ وشە لە زارییەوە دەردەپەڕێتەدەر و دەڵێت:

((خە-نج-ە-کە-ی-خ-ۆ-مە...!!؟)) هێشتاشی لەگەڵدا بێت، کەس نەیزانی کە خەنجەرەکەی سولتان چۆن گەیشتە دەستی بکوژەکەی؟!

بۆ رۆژی دوایی و دەمەو ئێوارێ.. پاش ئەوەی سولتان هیچ هەست و خوستی نابێت و هیچ نایێتە دەر.

وەزیری دەستە راست دەکەوێتە غایەڵە و دڵەڕاوکێ.. بە دوو دڵییەوە، دەچێتە بەردەم دەرگای ژوورەکەی سولتان و دەنگی لێ دەکات:

((گەورەم خۆ شکور جەنابتان ساغ و سەلامەتن!؟))

چەند جارێك هەمان دێڕ دووبارە دەکاتەوە و هیچ وەڵامێکی بەر گوێ ناکەوێت. دڵی دەکەوێتە ختوورە و بە دەنگێکی لەرزۆك بەرپرسی سەربازەکان بانگ دەکات و پاش تاوێك بەرپرسەکە دەگاتە لای و بە کلیلەکەی گیرفانی دەرگاکە دەکاتەوە و هەردووکیان پێکەوە دەچنە ژوور؛ دەبینن سولتان لە خوێنی خۆیدا گەوزاوە و خەنجەرە دەسك زێڕینەکەی خۆیشی لە مشتدایە.

بەرپرسی سەربازە تایبەتییەکانی سولتان.. بە پەشۆکاوی و لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

((ناکرێت و ناشێت.. کچەکەم بە دەستی خۆم بەستەوە.. تۆ بڵێی سولتان بەدەستی خۆی کردبێتییەوە!؟))

گەرچی بە مەبەستی دۆزینەوەی کچەکە، هەموو جێگە و شوێنێکی ناوەوە و دەرەوەی ژوورەکە دەگەڕێن، بەڵام سەری سندووقە مام ناوەندییەکەی نێو ژوورەکە هەڵنادەنەوە.. چونکە بەلایانەوە ئەستەم دەبێت کە کچۆڵەیەکی باڵا بەرزی وەك کچە قەرەجەکە؛ بتوانێت لەنێویدا جێی خۆی بکاتەوە.

ساڵانێکی دوور و درێژ، ژوورەکەی سولتان بە کلۆم دراوی جێ دەهێڵن!!؟...

تا لە کودەتایەکدا، کۆمەڵێك لە کۆنە دوژمنەکانی سولتان دەست بەسەر کۆشکەکەدا دەگرن و دەرگای ژوورەکەی سولتان دەشکێنن و هەموو شتێکی نێو ژوورەکە هەڕاج دەکەن.

گەرچی زۆر خۆیان بە سندووقەکەوە خەریك دەکەن؛ بەڵام نە سەرەکەیان بۆ هەڵدەدرێتەوە و نە سندووقەکەشیان بۆ دەشکێت!؟

پاش ماوەیەك گێلە بازرگانێك دەدۆزنەوە و سندوقەکەی بە ترخێکی باش پێ دەفرۆشن و پێی دەڵێن کە گوایە؛ سندوقەکە دارێکی سیحریی تێدایە و ساڵی یەکجار سەری سندوقەکە دەترازێت.. گەر کەسێك بەردەوام بە دیارییەوە تێشك بگرێت؛ دەتوانێت لەکاتی ترازانی سەردکەیدا، دارەکە بهێنێتەدەر. ئەوەی بیێتە خاوەنی ئەو دارە سیحرییە، لە دنیادا چی بوێت بە بێ سێ و دوو بەدەستی دەهێنێت.)

کە بە ئاگا هاتمەوە؛ یان رەنگە بە ئاگایان هێنابێتمەوە!!؟ دەستنووسەکەم بیرکەوتەوە...



پێڵووەکانم لێك ترازان و بەسەرسامییەوە روانیمە پێش خۆم!؟ تیشکی لایتێك چاوی دەچووزاندمەوە.

دەستم بۆ چوارچێوەی چاویلکەکەی چاوم و هاوێنەکانی برد؛ هاوێنە رەشەکان لابرابوون و دوو هاوێنەی روونی ئاساییان لەجێ دانرابوو.

هێشتاکە بینایم لێڵ و تەڵخ بوو؛ بەرچاوم بە تەواوی روون نەبووبۆوە.. کورسییەکانی ئەو شوێنەی کە تێیدا بووم، بە چەشنی کورسییەکانی نێو واگۆنی میترۆکە، ریز کرابوو.

بەڵام پێ نەدەچوو کە لەناو هەمان واگۆنی پێشوودا بم!؟...

ئەو لایتەی کە راستەوخۆ دەیدا لە چاوم و پەیتا پەیتا دەکوژایەوە و هەڵدەبوو؛ نەیدەهێشت بە تەواوی کەلوپەلەکانی دەوروبەری خۆم بۆ جیابکرێتەوە.

کەسەکەی تەنیشتم وەبیرهاتەوە؛ لە شوێنی خۆی بێ هەست و خوست دانیشتبوو!!؟

لەوەدابوو کە هەستمە سەر پێ، لایتەکە کوژایەوە و ئەو شوێنەی کە تێیدا بوون، وەك شەوی ئەنگوستە چاوی لێ هات. هێندە تاریك ببوو، بە زەحمەت توانیم لە هەمان شوێنەکەی پێشووی خۆم دابنیشمەوە!؟

ناو بە ناو و بۆ چەند جارێك دەنگم لە کەسەکەی تەنیشتم کرد و هیچ سەدا و دەنگێکی نەبوو.

دەستم گەیاندە ئەژنۆی و راموەشاند.. سەرەتا سڵەمیەوە و بە پەلە دەستم کێشایەوە. پاشان هاتەوە سەرخۆم و بۆ جارێکی دی دەستم بۆ ئەژنۆی برد؛ نەرمی و رەقییەکی سەیری ئەو شوێنەی کە دەستم بۆ بردبوو.. سەر پەنجەکانی دەنێشاند.

دەتگوت دەستم بۆ مۆمێك بردووە!!؟

تا پێم کرا، کلاوەی ئەژنۆیم بە پەنجەکانم گوشی. بەڵام تەنها نینۆکەکانم رۆچوونە نێوی و دەستم کرد بە هەڵکڕاندنی.. توێژاڵ توێژاڵ هەڵی دەدا و برێکیشی وەك چەوورییەك لە ژێر نینۆکەکانما کۆبۆوە.

شان و لا ملیم دۆزییەوە و نینۆکەکانم تێگیرکرد و هەڵمکڕاند... پاشان دەستم بۆ بەشەکانی دیکەی جەستەی برد و زانیم کە گشت بەشەکانی جەستەی لە یەك ماددە دروست کراوە.

دەستم بۆ سەری بردو کلاوە قژێکم بە دەستەوە هات؛ درێژ و تێکەڵ تاڵە موودکان بە بەشی دەرەوەی کلاوەکەوە لکێندرابوون.

دەستم بۆ کەللە سەری برد، لووس و چەور بوو، لوتم نا بە تەپڵە سەریەوە و بۆنم کرد؛ بۆن مۆمی لێ دەهات.

گەر هێندە تارێك نەبایە، دەمتوانی لێی ورد ببمەوە و تێی بڕوانم.. دەستێکم بۆ ئەو زەلامە برد، کە پێشتر و پێش ئەوەی بە تۆزێی دەستنووسەکەم پێ بخوێننەوە؛ هاتە تەنیشتم و لایەکی چاکەتەکەی لادا و دەمانچە شاراوەکەی بەرپشتێنی پیشان دام.

دەمانچەکەیم بە دەستەوە هات؛ نازانم بۆ وەك داخ لە دڵێك هەموو هێزی خۆم خستە سەری و لەنێوەڕاستەوە وەك مۆمێك شکاندم!؟

دەستێکم برد بۆ چمکێکی چاکەتەکەی؛ رەق راوەستابوو...

تا هێزم تێدابوو، بۆکسێکم لە ورگی دا...

وەك پەیکەرێك لە جێی خۆی هیچ نەجوولاّ.

گومانم لەو کورسییەش لا دروست بوو؛ کە لەسەری دانیشتبووم!؟

چەند دەستم گێڕا.. لەڕووی قەبارەوە هێندەی لەگەڵ کورسی نێو واگۆنی میترۆکە فەرق نەبوو. جیاوازییەك کە بە دەست لێدان هەستم پێ دەکرد؛ کورسییەکەش لەڕووی رەقی و نەرمییەوە، وەك کەسەکەی تەنیشتم و زەلامەکەی کە بە تەنیشتمەوە راوەستابوو، وابوو.

بە تەواوی سەرسام ببووم؛ بۆ دەبێت پاش خوێندنەوەی ئەودەستنووسە، کە لەنێو واگۆنەکەدا دایانە دەستم؛ منیان بۆ ئێرە هێنابێت!؟ یان تۆ بڵێی...!!؟

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((بۆ بڵێی هەر لە سەرەتاوە، هاتبێتمە ئێرە و لەگەڵ ئەم مۆمە پەیکەرانەدا.. رێگەی دوا ئێستاسیۆنی میترۆکەم گرتبێتە بەر و پێم وابووبێت، کە ئەم واگۆنە..... دەمگەیەنێتە جێ!!؟))

نەدەکرا لەوە زیاتر، ددان بە خۆمدا بگرم و هێدی و لەسەرەخۆ چاوەڕێ بم. نەمدەزانی چۆن لەم جێگە سەیر و سەمەرەیە هەڵبێم!؟

نەدەبوو هەر لە سەرەتاوە بێمە ناو ئەم واگۆنە شوومە، ئەگەر لەڕاستیدا و پێشتر لە ناویدا بووبێتم، یان لە ئێستادا لەناویدا بم!!؟

تێنەدەگەیشتم لەوەی کە بۆ دەبێت، دەستنووسێکی جودا و جیاواز لە دەستنووسە ئەسڵییەکمیان پێ خوێندبێتمەوە...

تۆ بڵێی لە پەنایەکەوە دەقا و دەقی خوێندنەوەکەمیان تۆمار کردبێت!؟

لەناکاو پڕ بەدەم و بە چەشنێك هاوارم کرد؛ کە بۆ ماوەیەك گوێیەکانم کاس بوون.

تا ماوەیەك گوێم لە هیچ هەست و خوستێك نەبوو!!؟

دواتر گوێم لە دەنگی پێی چەند کەسێك بوو، کە بە پێپلیکانەیەکدا دەهاتنە خوار.. بە ژمارەی تیشکی لایتەکانیاندا پێنج کەس بوون.

پاشان گوێم لە دەنگی خستنەگەڕی دینەمۆیەك بوو، کە دیار بوو لە نزیك ئەو شوێنە دانرابوو؛ کە منی لێ دانیشتبووم.

سەرەتا گڵۆپەکان، چەند جارێك هەڵبوون و کوژانەوە... پاشان بە تەواوی هەڵبوون.

چاوێکم بە دەوروبەری خۆم و ئەو شوێنەدا گێڕا؛ کە تێیدا بووم.. جێگە و شوێنێکی لە شووشە دروستکراو بوو.. کە بەشێوە، لەواگۆنەکەی پێشووی میترۆکە دەچوو.. ناوەوەشی بە تەواوی لەنێو واگۆنەکەی پێشوو دەچوو، کەسەکانی نێویشی هەر بە کەسەکانی پێشووی نێو واگۆنەکە دەچوون.. هێندە هەبوو ئەمان پەیکەر ئاسا لە جێی خۆیان نەدەبزوان.. هێشتاکە کوڕە زەردکارەکە روومەتی لە جامەکە جوودا نەکردبۆوە... کەسەکەی کە لە تەنیشتم دانیشتبوو.. کابرا کەڵەگەتە بە پێوە راوەستاوەکەی لاتەنیشتم؛ هەموو ئەوانەی دیکەش هەر هەمان کەسەکانی پێشوو بوون، لە رووخسار و رواڵەتدا!!؟..تەنانەت وێنەی کچە گۆرانیبێژە؛ ناودارەکەی شاری (مۆنتوا)ش لە سوچێکی جامەڕەش بۆوەکانی ئەم واگۆنەشدا هەڵواسرابوو.

ئەدەکرا هەر لە سەرەتاوە، لێرەدا بوو بێتم!!؟

لەپڕ کچە رەشتاڵەکەم وەبیر هاتەوە؛ بەڵام چەند چاوم بۆ گێڕا.. بە دیم نەکرد!؟ هێشتاکە زنجیرەکەی لە گیرفاندا بوو...

جانتای کەسەکەی تەنیشتم گەڕام، هیچی تێیدا نەبوو!؟

ئەو پێنج کەسەی کە پێشتر بە پێپلیکانەکاندا هاتنە خوارێ؛ هێشتاکە نەهاتبوونە نێو ئەم شوێنەی کە تێیدا بووم.

پاش ماوەیەکی دوور و درێژ لە دانیشتن؛ هەستامە سەر پێ و چەند شەقاوێکم نا.. کەسێك نەبوو؛ دامنیشێنێتەوە و نەهێڵێت لە جێی خۆم بجوڵێم!؟

سەرەتا، کەمێك بەناو واگۆنە شووشەییەکەدا گەڕام و لێی ورد بوومەوە...

پاشان کە چوومە بەر دەرگاکەی؛ بۆ خۆی هەروەك دەرگای واگۆنی پێشووی میترۆکە کرایەوە. چوومە دەر و بە لای راستدا چەند هەنگاوێکم نا، دواتر زۆر بە خێرایی بە تەنیشت ریزێ واگۆنی شووشەیدا تێپەڕیم و پاشان هەڵوێستەیەکم بۆ کرد و

دواتر لە دەرگایەکی بەرامبەر بە یەکێك لە واگۆنەکان، ئاودیوبووم و چوومە نێو ژوورێکی ناوێنە بەند چلکن و کوولکن؛ لە ناوێنەکاندا خۆم دەهاتە پێش چاو..

بۆینباغەکەم لە ملدا نەمابوو.. یەك دوو قۆپچەی کراسەکەم لێ ببوزوە.. پانتۆڵەکەم لە هەردوو لاتەنیشتەکانییەوە، بستێك درابوو.

لە دەرگایەکی ژووره ئاوێنە بەندەکەوە، چوومە نێو ژوورێکی دی؛ کە دیوار بنمیچ و عەردەکەی لە دار دروست کرابوو.. تیشکێکی کز ژوورەکەی رووناك دەکردەوە؛ کە لە گڵۆپێکی هەڵواسراوی شۆڕەوەبوونی سەرو تەپڵە سەرمەوە پەخش دەبۆوە.. سێبەری خۆم نیو مەترێك، لە پێش خۆمەوە گرمۆڵە ببوو؛ کە بە هیچ شێوەیەك هاوتەبایی لە نێوان چەشن و شێوەی جوولەی هەردووکماندا نەبوو، کاتێك من دەستم دەبزواند، ئەو دەستی لە گیرفانی دەنا.. کە لە جێی خۆم رادەوەستام ئەو هەنگاوی دەنا و کە هەنگاوم دەنا ئەو جوولەی لە خۆی دەبڕی و رادەوەستا.

ئەمویست لەوە زیاتر لە سێبەرەکە بڕوانم و کەوتمە سەیرکردنی دیوارە لە دار دروست کراوەکە، هەندێك شوێنی بە بۆیەیەکی زەردی مەیلەو قاوەیی کەمێك بۆیە کرابوو.

بە هێڵێکی زۆر باریکی سپی بە گچکەیی لەلایەکی دیوارەکەدا ئاماژەیەك بۆ شوێنی عەردی لایەکی ژوورەکە کرابوو.

لە جێی خۆم هەڵترووشکام و چەندم پێکرا کەوتمە سەرنجدانی عەردەکە.. هێندەی حەوت هەشت کاشی شوێنی جێگەیەك بە هێڵێکی سووری باریك دەستنیشان کرابوو، دەستم خستە سەری و بۆ ناوەوە، وەك دەرگایەك کرایەوە.. پەیژەیەکی لە دار دروستکراوی دوور و درێژ لە ژێردا، بە پێوە راوەستێنرابوو..

بە پەیژەکەدا چوومە خوارێ.. گەرچی بێجگە لە کزمەڵێ مۆمی داگیرساوی، چوار دەوری ژێر پەیژەکە؛ هیچ سەرچاوە رووناکییەکی تر لە ئارادا نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هێندەی پێویست بوو، رۆشناییەك بەر پێمی رووناك دەکردەوە؛ کە پێ بە پێ لەگەڵمدا دەهاتە خوار و هیچ پەیوەندییەکی بە تیشك و رۆشنایی مۆمەکانەوە نەبوو.. کە بە حاڵ چواردەوری خۆیان بۆ رووناك دەکرایەوە.

پاش ئەوەی گەیشتمە خوار پەیژەکە و پێنج شەش مەترێك بۆ پێشەوە هەنگاوم نا.. رووبەڕووی ڕاڕەوێکی کەمێك رووناك بوومەوە. هێندەی نەبرد لەوێوە چوومە نێو هۆڵێکی چارخانەوە، کە بە مۆزەخانە دەچوو؛ گەرچی هیچ جۆرە کەل و پەل و شتومەکێکی مێژوویی تێیدا نەبوو.

پۆترێتی کۆمەڵێ کەسایەتی مێژوویی، لە شێوە تابلۆی مام ناوەندیدا.. بەریز و یەك لە دوای یەك، بە دیوارەکانییەوە هەڵواسرابوو.

یەك دووجار، هەموو تابلۆکانم بەشێوەیەکی گشتی سەیر کرد و هیچی وام بەدی نەکرد!؟

لەوەدا بوو، کە برژم.. کاتێك یەکێك لە تابلۆکان سەرنجی ڕاکێشام. گەرچی سەر و سیمای کەسایەتییە وێنەکراوەکەی سەر تابلۆکە؛ بە سەر و سیما لە کەسایەتی تابلۆکانی تر دەچوو.. بەڵام جودایی و جیاوازی جل و بەرگەکەی بەری؛ بە بەراورد لەگەڵ جل و بەرگی کەسایەتییەکانی تر.. جێگەی پرسیار بوو. جل و بەرگی تەواو لە جل و بەرگی، کەسانی ئەو شارۆچکەیە دەچوو؛ کە پێشتر تێیدا ژیابووم!؟

زۆر بە وردی لێی وردبوومەوە و لە خوار تابلۆکەوە و لەسەر دیوارەکە کۆمەڵێ پیتم کەوتە بەرچاو؛ کە بە خەتێکی کەمێك درشت و بە مەرەکەبی سوور نووسرابوو:

(و-ە-ل-ی-س-ڵ-ێ-و-ە)

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((تۆ بڵێی هەر ناوی لەو کەسە بچێت کە لە دەستنووسەکەدا ناوی هاتووە؛ یان...!!؟))

بۆ جارێکی تر ڕوانیمە تابلۆکە و ماوەیەکی دوور و درێژ تێی ڕامام و پاشان لە باگگراوندێکی دووری تابلۆکەدا، تارمایی سندووقێکم بەدی کرد.. کە سەردەکەی واڵا و کراوە بوو؛ کۆمەڵێ قفڵ و زنجیرێکی دوور و درێژیش، لە بەردەمیدا کەوتبوو.

پاش تاوێك.. هەر کە لە دەرگایەکی تری هۆڵەکەوە چوومە دەر، هەروەك ئەوەی کە کەسێك پێی گوتبێتم؛ بەوێدا سەرکەوە.. لەنێو چەند پێپلیکانەیەکی، لە پاڵ یەکدا؛ یەکێکیانم هەڵبژارد و خانە خانە سەرکەوتمە سەر.

* * *

هێشتاکە پێنج شەش خانەی پێپلیکانەکە مابوو، تا بگەمە سەر ئەو ڕێگەیەی کە بەرەو دەرگای دەرەوەی ئێستاسیۆنی میترۆکە دەچوو؛ کە دەسپێك و کۆتایی ئەو خەونە ترسناکەم وەبیر هاتەوە، کە نەمدەزانی لە چ شوێن و کاتێکدا بینیبووم!؟

ئەو خەونە سەیر و سەمەرەیەی، کە هیچ کاتێك، نێوەڕاستەکەیم... وەبیرنەدەهاتەوە!

بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم، وەدووی تارماییەك کەوتبووم.. کە لە پێشمەوە بە پێپلیکانەکاندا سەردەکەوت.. نازانم بۆ لەو کاتەدا وام هەست دەکرد، کە وەدووی تارمایی کچۆڵە ڕەشتاڵە باڵا بەرزەکە کەوتبێتم؛ کە پێشتر لەنێو واگۆنی میترۆکەدا بینیبووم...

هێشتاکە زنجیرە پساوەکەی لە گیرفاندا مابوو!؟

کە گەیشتمە ئاستانەی دەرگای دەرەوەی ئێستاسیۆنی میترۆکە، هەروەك ئەوەی چاو بۆ ئاشنایەك بگێرم، ئاوا چاوم گێڕا و کەسم نەبینییەوە.

هێندێ هێندێ ئەوێم جێهێشت و خۆم سەرقاڵی سەیرکردن و ژماردنی دارتێلەکانی ناوەڕاستی شەقامەکە کرد. بە چەشنێکی جودا و جیاواز لە هەموو دارتێلەکانی تری دنیا دروست کرابوون.

بەشێوە لە دەست و قاچی بنیادەم دەچوون، بەڵام سەد هێندەی دەست و قاچی بنیادەمان گەورە بوون و هێندەش درێژبوون کە بە حاڵ گڵۆپە زەردباوەکەی سەر بەرزترین خاڵی دارتێلەکانت دەبینی، بەو حوکمەی کە لەو بەرزییەشەوە دەبینرا؛ دەبوو گڵۆپێکی زۆر گەورە بێت!؟

ئەو دەمانە هەڵدەبوون، کە ئۆتۆمبیلێك شەقامەکەی بڕیبا.. یان پیادەڕەوێك بە ژێریدا تێپەڕیبا.

تا بڵێی ڕۆژێکی ساردبوو؛ گەرچی هێشتاکە کلووە بەفرێکیش چییە نەباریبوو.

لە ناکاو بایەکی بە گف و هوڕ، بۆ ساتێك چەقبەستوو لە جێی خۆم ڕایگرتم، هێندەی نەمابوو لەجێی خۆم هەڵمکەنێت و ودحەوام بدات.. وەك گورگێك لوورەی دەهات و جل و بەرگی بەرمی فوو دەدا.

باش بوو، زۆری ئەخایاند و لەپڕ هەروەك ئەوەی كە نەبووبێت؛ لە ساتێكدا لـوورە و گڤەی نەما و لە پشتمەوە بەرەو سەر هەڵكشا.

بە دیوی دەستە راستی، كۆتایی شەقامەكەدا، دەرگای بازاڕێكی شووشە بەند و والاّ لەسەر پشت بوو.

پێشتر ئەو بازاڕەم لەو شوێنەدا نەبینیبوو!؟

هەر كە لە دەرگاكەیەوە چوومە ژوور؛ لەسەر دیواری دەستە راستی یەكەم دووكانی بازاڕەكەدا، چاوم بە نووسینێك كەوت.. كە نووسرابوو:

(نارنج و دەعبای دەگمەن و تەیر و تووی عەجاییب، لەم بازاڕەدا دەست دەكەوێت.)

ئەوەی كە زۆر سەرنجی راكێشام و ماوەیەك تێی رامام.. خشۆكێكی یەك دوو مەترە درێژ و لەش تەشیلەیی بوو، كە لەنێو حەوزێكی شووشەدا دایاننابوو؛ هەر دەتگوت دیناسۆرێكی گچكەیە. پێستێكی دركاوی و لۆچاوی هەبوو، بە چەشنی پۆپنەی كەڵەشێرێك، چەند دركە نێسێك لە تەپڵی سەریەوە هاتبوونەدەر، هێندەی زەلامێكی قەڵەو و زۆر خۆر غەبغەبە بە ملیدا شۆڕ ببۆوە.. پەلەكانی پێشەوە و دواوەی چاوی كەسك و زمانێكی درێژ و هەڵتاوساوی هەبوو.

لەبەردەمیدا چەند پارچە گۆشتێكی كەنیو، دانرابوو.

تێی دەڕوانیم و لێم ورد دەبۆوە.. زمانی بۆ دەهاویشتم؛ كە نیو مەترێك لە پێش خۆیەوە درێژ دەبوو.. سەری زمانی ماددەیەكی لینجاویی سڕێش ئاسای پێوە بوو، كە دەینا بە هەر شتێكەوە ماوەیەك بەو شتەوە دەنووسا.

گەرچی یەكەمجارم بوو، كە خشۆكێكی لەو توخم و جۆرە ببینم، بەڵام نازانم بۆ وا هەستم دەكرد؛ كە رەنگە پێشتر لە شوێنێكی دیكەی دنیادا، ئەم چەشنە خشۆكەم بینیبێت.

بۆ تاوێك، هەروەك ئەوەی شارە مێروولە بە لەشمدا هەڵگەڕابێت و پەیتا پەیتا بگەزێت؛ تۆقردم لێ بڕا و بەپەلە ئەو ناوەم جێهێشت.

بەرەو دەرگایەکی پشتەوەی بازاڕەکە، هەنگاوم نا و لەوێشەوە ڕێگەی کۆڵانێکی پێچاوپێچم گرتەبەر، کە زیاتر بە گەڕەکێکی هەژارنشین دەچوو، خانووەکانی سادە و ساکار و یەك دوو نهۆمی بوون، زۆربەی ئەوانەی کە لە سووچ و گۆشەی کۆڵانە پێچاوپێچەکەدا بە تووشەوە بوون؛ پێشتر لە بالکۆنی خانووە دوو نهۆمییەکانەوە، تێیان دەڕوانیم..

سەیری هەر بالکۆنێکم کردبا و کێم دیتبا...

هێندە بەخێرایی لە بەردەمدا قووت دەبۆوە، کە بەلامەوە مەحاڵ و ئەستەم بوو، کە بەو خێراییە توانیبێتی لە بالکۆنەکەوە هاتبێتە خوار و خۆی گەیاندبێتە شوێنێکی دوورتر لەو شوێنەی کە من پێیدا تێپەڕ دەبووم.

کۆمەڵێ منداڵ لە بەردەم بینایەکی دوو نهۆمیدا، کە کەمێك لە بیناکانی تر گەورەتر بوو...

ساپ ساپانێیان دەکرد...

بیناکە وەك ڕەنگی ئاڵاکەی سەری بە سپی و شین بۆیە کرابوو..

کابرایەکی سوور فلی گرگن و قەڵەو؛ بە پەلە، لە دەرگای بیناکە هاتە دەر و گازی کردم.

کابراکەم نەدەناسی و بۆ یەکەجاریشم بوو، کە ئەو بینایە ببینم!؟

بۆ جارێکی تر ڕوانیمە بیناکە؛ هیچ نووسین و ئاماژە و ئارمێکی لەسەر نەبوو.. ئاڵا شەکاوەکەی سەریشیم، لە هیچ جێگە و شوێنێکی تردا نەبینیبوو.

دەبوو هەڵبێم و لەو ناوە دوور بکەومەوە!؟

هێشتاکە چەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبوومەوە؛ کە گازی دوو زەلامی کتوومت وەك خۆی کرد و بە دوومدا هاتن.

گەرچی گرگن و قەڵەو بوون.. بەڵام لە من خێراتر ڕایان دەکرد و کە دەستگیریان کردم؛ هێشتاکە نەگەیشتبوومە سەری کۆڵانەکە هەرچییەکم کرد، خۆم بۆ دەرباز

نەکرا، هێندەی نەبرد مێیان بردە بەردەم کابرا سوور فلەکەی، کە یەکەمجار لە دەرگای بیناکەوە هاتەدەر.

ماوەیەکی دوور و درێژ تێیڕوانیم و پاشان گوتی:

((کوا دەستنووسەکە!؟))

لە وەڵامدا گوتم:

((دەستنووسەکەیان، لە واگۆنەکەدا لێ سەندم.))

بێ سێ و دوو زاری هەڵهێنا و گوتی:

((بۆ چوویتە نێو واگۆنەکە!؟))

گەرچی زۆر سەرسام بووم بەوەی، کە ئەمیش هەموو شتێکی لە بارەمەوە دەزانی.

بەڵام دەبوو، بەخێرایی وەڵامی بدەمەوە و گوتم:

((بە پێی نامەیەکی تایبەت؛ کە لە گرووپی -؟-ەوە پێم گەیشتبوو.. دەبوو بگەمە دوا ئیستاسیۆنی میترۆکە و لەوێ...))

قسەکەی پێ بڕیم و بە عاجبایەتییەکەوە گوتی:

((کام نامە؟!)

گەرچی هەروەك ئەوەی لە گیرفانمدا بێت؛ سەرەتا دەستم بۆ گیرفانەکانم برد. بەڵام دواتر بیرم کەوتەوە کە گیرفانەکانم بەتاڵن و تەنها زنجیرە پساوەکەم بە دەستەوە هات و دەرمهێنا.

بۆ جارێکی دیکە دووبارەی کردەوە و گوتی:

((کام نامە؟!))

لە وەڵامدا گوتم:

((ئەو نامەیەی کە گرووپەکە بۆی ناردم!))

کابرا سوور فلەکە هێندە بەم وەڵامەی دوایەم، تووڕە بوو.. کە تا ماوەیەك قسەی بۆ نەکرا و کەفێکی سپی لە زاریەوە، بۆ چەند چرکەیەك داچۆڕایە خوار.

پاشان هەر چۆنێك بوو، هاتەوە سەرخۆی و گوتی:

((ئێمە ئەو گرووپەین، کە تۆ باسی دەکەیت و هێشتاکە نامەکەمان بۆ نەناردوویت و پێشمان سەیربوو، کە بێ ئەوەی نامەکەت بۆ بنێرین، بۆ خۆت ئەدرەسی بیناکەی ئێمەت دۆزیوەتەوە و بەپێی خۆت هاتوویتە لامان!!؟))

گومان و خۆفێکی سەیر، بە تاوەوە کرمە ڕێژیان دەکردم.. ڕاستییەکەی؛ نەمدەزانی چی بڵێم و چی بکەم. لەو ساتەوەختەدا، زۆر بەخێرایی سەر و سیمای هەموو کەسەکانی نێو واگۆنەکە بە بەرچاومدا تێپەڕ دەبوو.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((تۆ بڵێی کەسەکانی نێو واگۆنەکە؛ کێ بووبێتن؟!!))

کەسێك لە دواوە، زۆر بە توندی پێیدا کێشام...

کابرا بە چاوە زیتەکانی قەیرێك سەیری کردم، پاشان کەپووی بە دەستە سڕێك پاك کردەوە و لێکدا لێکدا، کەوتە بژمین و بۆ ماوەیەك نەیبڕییەوە.

هێندەی نەمابوو، کە پاڵێك بە هەردوو کەسەکەی پشتەوە بنێم و هەڵبێم؛ کابرای سوور فل دایە پرمەی پێکەنین و پاشان بە گاڵتە پێکردنێکەوە، گوتی:

((ئەی ئەو کەسەی کە ساڵانێکی زۆر لەمەو پێش و بۆیەکەمجار دەستنووسەکەی دایتێ.. ئەموستیلە زیوینەکەی پیشان نەدایت!؟ پێی نەگوتیت؛ هەر کەسێك هەمان ئەموستیلەی پیشان دایت و هەمان مۆری هاوشێوەی مۆرەکەی منی، لە پاڵ مۆرەکەی سەر بەرگی دەستنووسەکەدا؛ ئەو دەم دەستنووسەکەی بدەری... تۆ دەبوو دەستنووسەکە بۆ ئێرە بهێنیت و بیدەیتە دەستمان.. لەو نامەیەشدا کە قەول بوو، بۆت بنێرین.. تەنها شتێك کە بۆمان نووسیبووی، ئەدرەسی ئەو بینایە بوو.))

هەر کە قسەکانی تەواو کرد، بە بڵمە بڵم و لەبەر خۆمەوە گوتم:

((دەبوو هەر لە ڕێگە تەنگە بەرەکەوە گەڕابامەوە.. نەمهێشتبا زڵامە کەڵەگەتەکە خۆی لەژێر باڵم بنێت، دەبوو لەسەر عەردە کاشیکراوە ڕەش و سپییەکە، لێی ڕاکشابام.))

کابرا هیچی نەگوت و منیش ملم وەرچەرخاند و روانیمە ئەو منداڵانەی، کە لەلای دەستە چەپمەوە.. گەمەیان دەکرد.

گەرچی خۆم وا پیشان دەدا، کە بە تەماشاکردنی منداڵەکانەوە سەرقاڵم.. بەڵام لەراستیدا، چاوەڕێی ئەوە بووم؛ کە وەك دەستبەسەرێك بەرێمە نێو بیناکە.

هێندە چاوەڕێم کرد؛ کە هەرچی دەمار و ماسوولکەی لا چەپی ملم هەبوو، رەق و رەپ راوەستان.

دەنگی قیژە قیژ و زاق و زیقی منداڵەکان؛ کە تا دەهات وەك شەپۆلێك بەرز دەبۆوە.. گوێیەکانیان کاس کردبوو.

ملم بەلای راستدا، وەرچەرخاند و پاشان ئاوڕێکم بۆ دواوەوە دایەوە.. هەردوو زەلامەکەی لێ نەمابوو.

روانیمە ئەو کابرا سوور فلەی کە دەبوو لە پێشمەوە راوەستابێت؛ ئەویش وەك دوو کەسەکەی تر، دیار نەمابوو.

سەیر لەوەشدا بوو؛ کە دەرگای بیناکە زۆر بە مەحکەمی کڵۆم درابوو.. رەنگەکەشی لە جاران کاڵتر دەهاتە بەرچاو؛ ئاڵاکەی سەریشی بەدەستی کۆمەڵێ منداڵەوە؛ ریشاڵ ریشاڵ ببوو.



ئەو رێگەیەی کە گرتووبوومە بەر؛ رێگەیەکی بە بەردەڵان و زیخاوی و بە دڕك و داڵ بوو، رێگەیەکی سەیر و سەمەرە و عەجایب بوو، رێگەیەك بوو گەر بە درێژایی عومرێك و بەبێ وەستان، هەنگاوت نابا.. پێی نەدەچوو دوا مەنزڵ و کۆتاییەکەیت دیتبا.

نەمدەزانی پێڵاوەکانم لە چ قۆناغێکی ئەم رێگەیەدا جێهێشتبوو. بۆ دەبوو ناچار بم بەوەی، کە بە پێی پەتی ئەم رێگەیە بگرمەبەر. گەرچی چەندم لە وێنە پشێو و

پەرت و بڵاوەکانی رابردوو، بۆ کۆکرابا و چەندم تێڕوانیبا؛ لە سەرەتای رێگەکەدا جووتێ پێڵاوی شڕم لە پێدا بوو.

ئەنگوستەکانی هەردوو لاقم؛ دڵۆپ دڵۆپ خوێنیان لێ دەچۆڕا و لێرە و لەوێ، لە پاش خۆم جێ دەمان؛ بە چەشنێك کە دەکرا کەسانێك شوێن پێیم هەڵبگرن و بە دووەمدا بێن.

روانیمە ئەو هێڵە درێژە ئاسنینەی.. کە پێدەچوو، دەمێك ساڵ بێت هیچ شەمەندەفەرێکی پێدا رەت نەبووبێت. کەسانێك هەردوو هێڵە ئاسنینەکەیان، لە زۆر شوێن و جێگەیدا دەرهێنابوو. زۆر شوێنیشی بۆ خۆی و بە کاریگەری زەمەن؛ داخوراو و شکاوبوو.

ماندوو و شەکەت بە قەراغ هێڵە ئاسنینەکاندا، هەنگاوم دەناو بێ پەروا دەچوومە پێش. گەماڵە سەگێك، کە پێنج شەش مەترێك لە پێشمەوە و لە پاڵ دەستە راستی هێڵە ئاسنینەکاندا.. خۆڵی عەردەکەی بە چنگ لا دەدا و بۆ شتێك دەگەڕا.. بە دیتنم، بۆ تاوێك لە جێی خۆی راوەستا و پاشان هەروەك ئەوەی شتێکی ترسناکی بینیبێت.. سڵەمیەوە و پاشان بە بێدەنگی و بەخێرایی دوورکەوتەوە.

باڵندەیەك، یەك دوو جار، بەسەر سەرمدا باڵەفڕەی کرد و پاشان تا پێی کرا بەرز بۆوە و لەنێو تاقی ئاسماندا ون بوو.

لە شوێنێکی هێڵە ئاسنینەکاندا، هەڵتۆتەم کرد و روانیمە پێیەکانم. ئەو خوێنەی کە پێشتر لە ئەنگوستەکانەوە دادەچۆڕا.. گیرسا بۆوە و شوێن زامەکانیش قەتاغەی کردبوو.

هێندێ جار، تارمایی کچە رەشتاڵە قژ لوولەکەم دەهاتە پێش چاو؛ هەروەك ئەوەی لە پێشمەوە بێت و مەبەستی بێت بەرەو شوێنێکم بەرێت.

خەیاڵ و ئەندێشە و یاد و یادەوەرییەکانم.. بە چەشنی کزمەڵێ گەواڵە هەوری سرك و بزۆزی بەربا و باهۆزێکی بێ ئامان.. وەستانیان نەبوو!؟ هەردەم ساتەوەختی یادەوەرییەکانی منداڵی و هەرزەکاری و ئێستایان لێ تێکەڵ دەکردم.

بێ ئامانجێکی دیاریکراو و بەبێ ئەوەی بزانم کە بۆ کوێ دەچم.. ڕێگەیەکی دوور و درێژ و بێ کۆتام گرتبووە بەر.

گەر سەرجەم هەنگاوەکانی ساڵانی پێشووی خۆمم کۆکردبا و تەبار تەبار وەسەریەکم خستبا و ژماردبام. هێندەی ئەو هەنگاوانەی نەدەکرد؛ کە لە پاڵ ئەم هێڵە ئاسنینانەدا نابووم.

پێشتر و ساڵانێکی زۆر لەمەوپێش و لەو شارۆچکەیەی کە تێیدا دەژیام.. دوورترین شوێنێك کە جار جارە بۆی دەچووم.. لەوەڕگا و شینایەکی قەراغ شارۆچکەکە بوو؛ ئەویش پاش ئەوەی شوانێکم، لەوێدا کردبووە برادەر و ناشنای خۆم.. جار جارە بەناوی سەردانی ئەوەوە، ئەو ڕێگەیەم دەگرتە بەر و دەچوومە لای.

هەردەم بە گەرمی پێشوازی لێ دەکردم و هەمیشە قسە و باس هێندە سەرقاڵی دەکردین؛ گەر قوڵپ دان و گیزە گیزی کتلییە ڕەشەکەی سەر ئاگری چەند چڵەدار و چیلکە و چەوێڵەکە نەبایە.. ڕەنگە زۆر بە زەحمەت و ئاگا هاتباین. گەرچی لە ئێستادا زۆر لە قسە و باسەکانی ئەو دەمەم لەبیر خۆم بردبۆوە و ڕاستییەکەی نەمدەویست، وەبیادم بێتەوە.

بەڵام تامێك کە هێشتاکە لەژێر زمانمدا مابوو؛ تامەزرۆی خواردنەوەی ئێستیکانێ چای نێو کتلییە ڕەشەکەی ئەوی دەکردم.



جانتایەکی ڕەش لە پێشمەوە و لە نێوەڕاستی هێڵە ئاسنینەکاندا دانرابوو.. سەرەتا پێم وابوو، کە ڕەنگە تریك بێت و بە چەند هەنگاوێك پێی بگەم.

بەڵام پاش ئەوەی هەزار هەنگاوی یەك لەسەر یەك و بەردەوامی خۆمم ژمارد؛ نەگەیشتمە ئەو جێگەیەی کە جانتاکەی لێ دانرابوو.

گەرچی هەر لەو جانتا ڕەشەی خۆم دەچوو؛ کە لەکاتی سەفەردا لەگەڵ خۆمم دەبرد. بەڵام پێشم وانەبوو، کە جانتاکەی خۆم بێت!!؟

چونکە هەر کە ڕێگەی دوا نیستاسیۆنی میترۆکەی شاری –مۆنوا–م گرتەبەر و تا ئەو دەمەش کە چرومە نێو واگۆنەکە و بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لەنێو واگۆنەکەشدا مامەوە؛ جانتا ڕەشەکەم پێ نەبوو.

ئاشزانم بۆ لەو ڕۆژەدا، جانتا ڕەشەکەم لەگەڵ خۆم نەبرد و دەستنووسەکەشم خستە گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەم.

لەبەر خۆمەوە گوتم:

((دەبێت کێ لەجیی من لەگەڵ خۆی هێنابێت... پاشان برستی لێ برابێت و لە نێوەڕاستی هێڵە ئاسنینەکاندا و لە شوێنێکدا کە پێی نەدەگەیشتم؛ جێی هێشتبێت.))

برسی و تینوو بە نێوەڕاستی هێڵە ئاسنینەکاندا، هەنگاوم دەنا... هەنگاونان و ڕۆیشتن، جەستەمی هێندەی تر سارد و سڕتر دەکرد.

تاوە لەرزێك، مێرووله ئاساو لە پڕ لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دیکەی جەستەم، گوزەری دەکرد.

دەنگی لەناکاوی قەڵەڕەشێك، کە لە دوامەوە دەنگی دەهات؛ ڕاپچڵەکاندم و هێندەی نەمابوو، بە ساتەکردنێکی پێم.. سەرم بەرلایەکی هێڵە ئاسنینەکان بکەوێت.

بۆ جارێکی تر، جانتا ڕەشەکە لە نێوەڕاستی هێڵە ئاسنینەکاندا و لە پێش خۆمەوە بە چەند مەترێك، وەدەرکەوت. دەمویست بیگەمێ و لە نزیکەوە تێی بڕوانم؛ پاشان زنجیرەکەی بکەمەوە و وەك عەمودالێك.. لەنێویدا بە شوێن شتێکدا بگەڕێم!!؟

نەدەکرا لەوە زیاتر هەنگاو بنێم.. شەکەتی و ماندوویتی زۆریان بۆ هێنام. لەنێوەڕاستی هەردوو هێڵە ئاسنینەکەدا هەڵتروشکام و بۆ تاوێك چاوەکانم لێك نا.



پێم وابوو، کە لە لەتە ئاوێنەیەکی شکاوەوە، دەڕوانمە دوا گەڵای وەریوی تاکە درەختێکی تەنیشت ئەو دوا نیستاسیۆنەی شاری –مۆنوا–؛ کە چاوەڕێی دوا میترۆی نیوەشەوی دەکرد.

دەسپێك و کۆتایی خەونە سامناکەکە، لە لەتە ئاوێنەکەدا وەك وێنەیەکی تەڵخ و شێواو و تێکەڵ دەهاتە بەرچاوم.

وێنەی گوڵە مێخەکێکی پەمەیی، نێو پەرداخێکی شین؛ لەسەر و چوارچێوەی پەنجەرەکەی بەردەمەوە هەڵواسرابوو.

هەروەك ئەوەی لە ژوورەکەی خۆمدا بم؛ هەستامە سەر پێ و بەرەو لای پەنجەرەکە هەنگاوم نا. گەرچی رکم لە هەموو پەنجەرەیەکی داخراو دەبۆوە؛ بەڵام لەو رۆژە زۆر ساردەدا، نەدەکرا والآی بکەم و بیخەمە سەر پشت.

ریشۆڵەیەکی سپی لەسەر دار تێلێکی تەنیشت دوا ئیستاسیۆنی شاری —مۆنوا—، بەڵام هەڵکوورما بوو؛ پێ دەچوو کزە بای سارد و سڕی ئەو ساتەوەختە، لە جێی خۆی سڕی کردبێت.

گەڕامەوە بۆ سەر ئەو کورسییەی کە لە بەردەم مێزە قاوەییەکەدا دانرابوو، ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو، کە کاغەزەکانی سەر مێزەکە بپێچمەوە.

ئەو نامەیەم لە چەکمەجەی مێزەکە هێنایەدەر، کە رۆژێك لەمەو پێش پێم گەیشتبوو، هەروەك ئەوەی کە پێشتر بە تەواوی لێی حاڵی نەبووبێتم؛ بۆ جارێکی تر، کەوتمە خوێندنەوەی:

(لە رۆژی (؟).. سەعات (؟).. خۆت بگەیەنەرە دوا ئیستاسیۆنی شاری —مۆنوا— ......)

نامەکەم قەد و نوشت کرد و خستمە ژێر سەرینەکەم.

دەستنووسەکەشم خستە نێو ئەو جانتا رەشەی کە هەردەم لە سەفەردا لەگەڵ خۆمم دەبرد.

ئەو بابەتەش کە دەمێك بوو بە نووسینیەوە خەریك بووم و بە خەتێکی شاش و لەسەر کاغەزی بۆر نووسیبووم، بەشێوەیەکی جوان پێچامەوە و لە گیرفانی ناوەوەی چاکەتە هەڵواسراوەکەی خۆمم نا.

بۆ ساتێك (وەلی سلێوە)م، وەك تارماییەك هاتە پێش چاو.. لەوە دابوو کە بیەوێت شتێکم پێ بڵێت!!؟

پێش ئەوەی زاری بترازێنێت و ئەوەی کە دەیویست بیڵێت؛ تارماییەکەی لەبەرچاوم نەما و ون بوو.

سەیری سەعاتە هەڵواسراوەکەی لا دیوارەکەم کرد.. هاکا دوا میترۆی نیوەشەو دەگەیشتە دوا نیستاسیونەکە.

کە پێڵووەکانم لێك نا...

هەستێکی سەیر، بەناخدا گوزەری کرد؛ هەروەك ئەوەی کەسێك بە چرپە پێم بڵێ:

((دەسپێك و کۆتایی خەونە ترسناکەکەت؛ لەبیرە!!؟))

بۆ تاوێك رامام و پاشان پەتی خەیاڵم بۆ شلکرد و گەڕامەوە بۆ ئەو ساتەوەختەی کە هێشتاکە نەگەیشتبوومە نیوەڕاستی رێگە تەنگە بەرەکە؛ بەڵام دووبارەبوونەوەی رەنگی رەش و سپیی کاشییەکان.. وەك ئەوەدەمە، دەسپێك و کۆتایی خەونە ترسناکەکەی وەبیر نەهێنامەوە.

شپرزە و شێواو وەدووی سەرە داوی زۆر لە یادەوەری و خەیاڵ و بەسەرهات و ئەندێشەکانی رابردوو کەوتم.

بەڵام هەروەك ئەوەی کە مێشکم سڕدرابێتەوە؛ شتێکی ئەوتۆم وەبیر نەدەهاتەوە.

تا سەعاتێکیش، لە جێی خۆم نەجوولام.. سەدای ئەو دێڕەی کە کەسێك، بۆ تەنها جارێك پێی گوتم؛ لە گوێمدا دەزرنگایەوە.

بالەفرەی شتێکی بەردەم پەنجەرەکە، برێك هێنامیەوە سەرخۆم و پەنجەرەکەم بیرکەوتەوە.

گەرچی رۆژێکی زۆر ساردبوو؛ بەڵام ناچار بووم، کە پەنجەرەکە واڵا بکەم و سەرم ببەمە دەر.

ئەمدەویست لەوە زیاتر، گوێڕادێری ئەو چرپە دەنگە بم...

بۆ تاوێك، لەو دار تێلە رامام؛ کە پێشتر ریشۆڵە سپییەکەی لەسەر هەڵکوورما بوو.

چاوم بۆ ریشۆڵە سپییەکە گێڕا...

لەژێر دار تێلەکەدا، بێ جووڵە کەوتبوو.

گەرچی هێندێ هێندێ، لە جاران باشتر دەبووم و لێرە و لەوێ شتێکم وەیاد دەهاتەوە، بەڵام لەوە نەدەچوو، کە بە ئاسانی بگەڕێمەوە بۆ ساتەوەختی پێش چرپەکە و دەسپێك و کۆتایی خەونەکەم وەبیر بێتەوە.

چریەی ئەو کەسە، چریەیەکی زۆر سەیر و سامناك بوو؛ تەك هەر دەستپێك و کۆتایی خەونەکەی لە بیر بردمەوە.. بەڵکو دەرگای زۆر بیرەوەری و ئەندێشە و خەیاڵی سادە و ساکاریشی؛ لە ناوەوە لێ کلۆم دام.

چاوم بۆ بینینی هەموو دیمەن و وێنەیەکی ژێر تیشکی گڵۆپی دار تێلەکان دەگێڕا...

پشیلەیەك لە پەنا دیوارێکدا دەمیاواند؛ پاشان خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی، کە ریشۆڵە سپییەکەی لێکەوتبوو.

خەڵکانێك سەیری سەعاتەکانیان دەکرد و لە دەرگای دەرەوەی ئیستا سێونەکەوە، دەچوونە خوار.

دوا کەسێك کە دەرگای ئیستاسیونەکەی تێپەڕکرد و بە پێپلیکانەکاندا چوونە خوار؛ پیرەژنێکی پرچ سپی بوو، کە بە ئەستەم هەنگاوی دەنا.

بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ روانیمە دەرگاکە... پاشان شکڵ و شێوەی گۆڕا لەبەرچاومدا و زیاتر وەك سندروقێکی تەختە هاتە پێش چاوم.

کزەبایەکی ئەو رۆژەی؛ کە یەکێك بوو، لە رۆژە هەرە ساردەکانی زستانێکی سارد و سڕ.. لەپاش پیرەژنەکەوە و بە ماوەیەك خۆی لەنێو ئەو دەرگایە نا؛ کە پاش تاوێك لەبەرچاومدا ئەما.

تەنها شتێك لەو کاتەدا، کە پێدەچوو بیرم کەوتبێتەوە.. یان مەبەستم بێت کە وەبیر خۆمی بهێنمەوە:

((ئەو رۆژە هەرە ساردەی؛ شاری —مۆنوا— بوو... کە هێشتاکە کلووە بەفرێك چییە؛ نەکەوتبوو)).

**کۆتایی**

**پاییزی ٢٠٠٢**